# سەربەستی لە ئیسلامدا




احمد کاکە محمود

١٩٨٣

سلێمانی/چاپخانەی نـەورەس ـ ت ٢٢٥٥٢٣

# سەربەستی لە ئیسلامدا

لە نووسینی

**ئەحمەد کاکە مەحموود**

١٤٠٤ کۆچی
١٩٨٣ زایینی

چاپخانەی نەورەس ـ سلێمانی ـ ت ٢٥٥٢٣

بسم‌الله الرحمن الرحيم

«متی استبعدتم الناس ٠٠٠٠٠؟! وقد ولدتهم أمهاتهم ٠٠٠ أحرارا»

ئاکەی خەلکی ئەکەن بـە بەندەو کۆیلە ٠٠٠٠ ؟! لە کاتێکدا بـە ئازادیی لە دایك بوون ٠

خەلیفەی دووەم (عومەری کوڕی خەتتاب)
خوای لێ ڕازیی بێت

× × ×

# پێشـــــەکی

## بسـم‌الله الرحمـن الرحیـم

ألحمد لله رب العالمین ، والصلواة والسلام علی سیدنا وقائدنا محمد وعلی آله وأصحابه ومن سلك نهجهم الی یوم الدین ٠

زۆر جار بەر گوێم ئەکەوت و ئەووترا : ئاینی ئیسلام سەربەستیی نەداوە بە مرۆڤ ٠٠ !!

ناهێڵێ بەرەو پێشکەوتن هەنگاو هەڵگرێ ٠٠ !!

ئەیەوێ مەردم هەر خەریکی (قەوانە کۆنەکە) ! بێت ئەیەوێ هەر خەریکی نوێژو ڕۆژو و ئەو جۆرە شتانە بێت ! ئەمانەو بە دەیان پلارو توانجی‌تر ٠

وا نیشان ئەدەن هەمـوو کون‌و قوژبنێـکی ئیسـلامیان پشـکاندبێت ، وە هەموو بوارەکانیان تاقی‌کردبێتەوە تۆزقاڵەیەك ڕۆشنایی‌یان بەدی نەکردبێت ٠٠!

وا نیشـان ئەدەن بە شەوو بە ڕۆژ بە دەردو خەفەتەوەن بـۆ دواکەوتنی کۆمەڵ‌و چارەسەرکردنی هۆیەکانی ٠

وا پیشان ئەدەن چاکی مەردایەتیی‌و جوامێرییان هەڵکردبێت بۆ ڕزگاریی‌و بەختیاریی ، ئیسلام نەی‌هێشتبێت ٠٠ !!

ئینجا منیش ـ وەك قوتابییەکی قورئان‌و موسڵمانێکی دڵسۆز بە کۆمەڵ ـ غیرەتم جووڵاو پێنووسم گرت بە دەستەوە بۆ لادان‌و دڕاندنی پەردەی تاریکی و نەدامەت ٠

بۆ دەرخستنی ڕاستیی‌و هەقیقەت ٠

بۆ تەتەڵەو بێژانی ئەو ووتانە لە ئیسلامدا ٠

بۆ ئەوەی هەموو کەس بزانێ ئەوانەی ئەو قسانە ئەکەن دوژمن‌و ناحەزی ئیسلامن‌و فریان بە ئیسلامەوە نییە ٠ بۆ ئەوەی دەرکەوێ‌و بزانرێ مەبەست‌و نیازی ژەهراوییان لە ووشەی (سەربەستی ـ حریة) ڕزگارکردنی کۆمەڵ‌و خاك‌و نیشتمان نییـە ، چونکە زۆربـەی بێگانـەکانیش ـ چ جـای ئـەوان ـ بۆیـان

دەرکەوتووە کە ئیسـلام ئایینێکە پڕە لـە سەربەستییو ئازایەتییو ئازادیی بۆ داوای مافو وەرگرتنی هەموو هەقە کۆمەڵایەتییەکان ٠

دەرکەوێ بـۆ هەموو لایـەك کە مەبەسـتی خاوەنی ئـەو نـاوو ناتۆرانە رزگارییو کامەرانییو ئازادییو ٠٠٠ هتد ٠ کۆمەڵ نییە ٠٠ بەڵکو مەبەستیان بەرەڵاییو ڕابواردنـە بەسەر شەکرەوی ئـەمو ئـەوەوە بێ ئـەوەی هیچ جۆرە یاسایەك بێدات بەژێر دەستیاندا ٠

ڕاکردنە لە یاسـا ، هەرچی ئـەکەن ـ لە دزییو جـەردەییو گزیکارییو بەرتیـلو ڕەشو ڕووتو تـاڵانو بڕۆ ٠٠٠ هەتـەد ـ ئـازادبن ، خەڵـکی بکەن بەقوربانی خۆیان بە مـەرجێ ئەوان سەربەستبن !! لە کاتێکیشا سـەربەستیی بە لای زانایانەوە ئەبێ لە پلەیەکا بێت زیان بەخش نەبێت نە بە خۆی ٠٠ نە بە تاك ٠٠ نە بە کۆمەڵ ٠٠ نە بە دەوڵەت ٠

هەر لەبـەر ئەمەیە لە هەمـوو وڵاتێکدا یاسـای جـۆراو جۆر دانـراوە ٠ سەرەڕای ئەمەیش ئەگەر یاسا نەبێت ژیانی ئاژەڵی دێتە کایەوە ٠٠ !

برای شیرینی خوێنەرم :

پرۆگرامو ڕێبازی ئیسلام وەنەبێت دەستی پێ نەگاتو نەتوانرێ تەماشاو دیراسە بکـرێو لێی بکۆڵرێتـەوە ، وەیان بشـارڕێتەوە لـە خەڵـکی ـ وەك پرۆگرامو یاساکانی تری جیهـان ـ نەوەك دیعایەو پروپاگانـدەکانی دەرکەوێو خەڵکی لێی بکشێتەوە ٠

ڕچەی ئیسـلام ڕوونو ئاشکرایەو لـە هەموو شـوێنێکدا دەست ئەکەوێو هەموو کەس ئەتوانێ لێی بکۆڵێتەوە بۆ دۆزینەوەی هەقو ڕاستیی ٠

برای خۆشەویست :

فەرموو بیر لـەم ئایەتانەو فەرمـوودەیە بـکەرەوە بزانـە چ ئازایـەتیو

مەردایەتێکیان تیایە ، وە چۆن داوای ڕاپەڕین ئەکەن دژی هەموو زاڵمو ستەمکارێك ٠٠ ! وە چۆن داوا ئەکەن کە :

هەرکەس نووکە دەرزییەکی پیاچەقانیت ، تۆیش بۆت هەیە نووکە دەرزییەکی پیابچەقێنیتەوە ٠ ئینجا بۆت دەرئەکەوێ کە ئەو توانج‌گرانە بێجگە لە بەرەڵایی‌و سەربەستییەکەی ئازیان نەبێت هیچی‌تریان پێش‌چاو نەگرتووە ٠

فەرموو تۆو هەندێ لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز :ـ

«ان الذين توفاهم الملائكة ظالمي أنفسهم قالوا فيم كنتم قالوا كنا مستضعفين في الارض قالوا ألم تكن أرض الله واسعة فتهاجروا فيها فأولئك مأواهم جهنم وساءت مصيرا» ـ النساء/٩٧ ٠

«فمن اعتدى عليكم فاعتدوا عليه بمثل ما اعتدى عليكم ٠٠» البقرة/١٩٤ ٠

«وقاتلوهم حتى لا تكون فتنة ويكون الدين كله لله ٠٠» الأنفال/٣٩ ٠

«وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدوالله وعدوكم ٠٠٠» الانفال/٦٠ ٠

«يا أيها النبي حرض المؤمنين على القتال ٠٠٠» الأنفال/٦٥ ٠

«٠٠٠ فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم وخذوهم واحصروهم واقعدوا لهم كل مرصد ٠٠٠» التوبة/٥ ٠

«وان نكثوا أيمانهم من بعد عهدهم وطعنوا في دينكم فقاتلوا أئمة الكفر انهم لا أيمان لهم لعلهم ينتهون ٠٠٠» التوبة/١٢ ٠

«وليأخذوا حذرهم وأسلحتهم ود الذين كفروا لو تغفلون عن أسلحتكم وأمتعتكم فيميلون عليكم ميلة واحدة ٠٠٠» النساء/١٠٢ ٠



وحق الزين

«قاتلوا الذيـن لا يؤمنون بالله ولا باليـوم الاخر ولا يحرمون مـا حرم الله ورسوله ولا يدينون دين الحق ۰۰۰۰» التوبة/۲۹ ۰

«۰۰۰ وقاتلوا المشركين كافة كما يقاتلونكم كافة ۰۰۰» التوبة/۳٦ ۰

«وان عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم به ۰۰۰۰» النحل/۱۲٦ ۰

پێغەمبەری پێشەواو رزگارکەری بەرەی ئادەمیزادیش ئەفەرمێ :ـ

«هەرکەسێ کوژرا لە پێناوی سامانیا ئەوە شەهیدە ، هەرکەسێ کوژرا لە بەر پاراستنی خوێنیا ئەوە شەهیدە ، هەرکەسێ کوژرا لە پێناوی ئایینیا ئەوە شەهیدە ، هەرکەسێ کوژرا لە پێناوی شەرەفیا ئەوە شەهیدە» ۰

ئیتر خۆتو ویژدانت چۆن بریار ئەدەیت ۰۰۰ ؟

ئەمەیش دلۆپێـك بـوو لە دەریـای بێ بنی یاسای ئیسـلام ، وە بـۆ ئەم راستییە لەمە زیاتر پێویست نییە ، چونکە (مشتێك نموونەی خەرمانێکە) ۰

نووســـــەر

۱۳۹۸ی کۆچی ـ ۱۹۷۸ی زایینی

# سەرەتای باسەکان

زۆر جێگەی غەمو پەژارەیە کە ئەم هەمــوو «لاوانە» لایانداوە لە ڕێبازی ئیسلام ، وە هەر یەکەیـان بە پێی داخوازیی ئـارەزووی بەرنامەیـەکی دەست هەڵبەستو ناشراوی بـۆ خۆی هەڵبژاردووەو دوایکەوتووە ٠٠ وەیـا هەر بەبێ بەرنامە ئەسووڕێنەوە وەك (هەبوونایەتی = وجودی)یەکان ٠٠ !!

وا ئەزانم هۆی ئەوەیش ئەمەیە کە :

چەندەهای ساڵە ئیســلام لە یەك رواڵەتو دیمەندا پیشانی گــەلو کۆمەڵ ئەدرێت ٠٠ واتە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە گەشەو پێشکەوتنێکی بخرێتە پێشچاو٠ لەولایشەوە شەپۆلی بێ ئابڕوویی‌و ماددیەتی ئەوروپا ملقیدا ٠٠ ئینجا ئەمانیش ـ لاوەکان ـ ڕێگای بێ ئاکامیان گرتە بەر ، وە هەر یەکەیان خۆی کوتایە پاڵ یاساو ڕژێمێـکی دروستکراو بـە هیوای ئـەوەوە ـ بـە پێی بیــروڕای خۆی ـ بحەوێتەوە ٠

کەوابوو تــکا ئەکەین لە هەمــوو دڵسۆزێـکی ئیسلامو هەمــوو لاوێـکی تێگەیشتوو لە ئیسلام کە ئەم ئایینە پایە بەرزە لەیەك دیمەندا نیشان نەدرێت ، چونکە بۆ هەموو کاتو شوێن‌و هەموو گەلو نەتەوەیەك هاتووە ، هەروەك هەرچی گرێ کوێرەی ژیان هەیە دەست نیشانی کردووەو چارەسەریشی بۆ داناوە ٠

ئەوەتە قورئان ـ کە پرۆگرامی ئیسلامە ـ پێکهاتووە لە چەندەها ڕێبازو بناغەی گرنگ گرنگ کـە هەر کامێکیان بە ووردیی ڕاقەی تەواو بکـرێت بێ سەرپێچی‌و ملەملێ وەریئەگرێ ، وە ئەچەقێ بە دڵی هەموو ڕۆشنبیرێکەوە ٠

بۆ نموونە ئێمــە لەم پەڕاوەدا بــە پێی توانای خۆمان ـ پشت بــە خوای گەورە ـ خامە ئەخەینە کار بۆ ڕۆشنکردنەوەی (سەربەستیی) لە ئیسلامدا لەم

چەند خاڵانەی خوارەوەدا :ـ

١ ـ بەندە لە ئیسلامدا ··· (الرق في الاسلام) ·

٢ ـ سەربەستی لە ووتەو ڕادا ··· (حرية القول والرأی) ·

٣ ـ سەربەستی لە ئاییندارییدا ··· (حرية التدين) ·

٤ ـ سەربەستی لە زانیارییدا ··· (حرية العلم) ·

٥ ـ سەربەستی لە کارکردندا ··· (حرية العمل) ·

٦ ـ سەربەستی لە خاوەنێتیدا = موڵکایەتیدا ··· (حرية التملك) ·

٧ ـ سەربەستی لە جلو بەرگدا ··· (حرية اللباس) ·

٨ ـ سەربەستی لە داهێنانو بییردا ··· (الحرية في مجال الفكر) ·

جا وا بە درێژە یەکە یەکە باسیان ئەکەین ، بەڵام پێش ئەوە ، سەرێك لە چەند یاسایەکی کۆنی پێش ئیسلام ئەدەین سەبارەت بە (بەندە) بۆ بەراوردکردنی سۆزو داد لە هەردوولادا بەرانبەر بە بەندە ·

# یەکەم بەندە

## أ ــ بەندە لە پێش ئیسلامدا ٠٠

### ١ ــ دەوڵەتی یۆنان :ــ

ڕێژەی بەندایەتیی لەم دەوڵەتەدا بەڕادەیەك بوو ژمارەی بەندەکان پترتر بوو لە خەڵکەکەی‌تر ٠٠ بۆ نموونە لە شاری (ئەثینا)دا ژمارەی بەندە گەیشتە [١٠٠ر٠٠٠] سەد هەزار کەس کەچی ئازادەکان (٢٠ر٠٠٠) بیست هەزار زیاتر نەبوون ٠٠!!

ئەمە بەم جۆرە ، ئینجا سەبارەت بە چۆنیەتیی ڕەفتارکردن لەگەڵیاندا مێژوو سەر دائەخات کاتێ باسی ئەکات ٠٠! چونکە یاساو باویان وابووە ئەگەر بییانویستایە دەستی لاوە تازە پێگەیشتووەکان ڕام بکەن بۆ (چەك) گرتن ، ئەوانیان ــ بەندەکان ــ ئەکرد بە نیشانە بۆ دەست ڕاهاتن ٠٠٠ !!

بۆ کڕین‌و فرۆشتنیش با سەرێك لە شاری ڕۆمەی پایتەختی مەسیحییەت‌و ڤاتیکان بدەین کە بازارێکی گەورەیان تەرخان کردبوو بۆ کڕین‌و فرۆشتنی بەندە ٠٠ سەرەڕای ئەوەیش (تەپۆڵکە)یەکیان دروست کردبوو ئەبوایە ئەو بەندە هەزارەیان ڕووت بکردایەتەوەو بڕۆیشتایەتە سەری‌و کڕیاریش بە ئارەزووی خۆی تەماشای بکردایە ٠٠ ! هەروەك مەیدانی ئاژەڵ فرۆشتن ٠٠!!

بەکێك نەبوو بەزەیی پیایانا بێتەوە ، سەرەڕای ئەوەش پیاوی وەك «ئەفلاطون»و «ئەرسطو» ــ مامۆستای یەکەمی پیتووڵ ڕایان وابوو کە : چینی ئادەمیزاد لە بناغەدا جیاوازن ٠٠ هەندێکیان بە (ئاغایی) دروستکراون ! چونکە قوڕەکەیان بە ئالتوون شێلراوە ٠٠ ! وە هەندێکی تریان بۆ نۆکەریی ، چونکە قوڕەکەیان

لەگەڵ «ئاسن»دا شێلراوە(١) ••• !!

٢ ـ دەوڵەتی فارس :ـ

ئەمیش گەلێـك خوێنمژتر بوو لە (یۆنان) ، چونکە لای ئەمان ئاغـا هەر جارێـك قبـووڵی ئەکـرد بەنـدەکەی پێ لار دابنێت ئیتـر بـۆ جـاری دووەم ئەی‌کوشت ••!

٣ ـ لە دەستەڵاتداری [هیند]یشـدا (بەندە) چارە ڕەش‌تر بوو ، چونـکە هیند زۆربەی گەلەکەی پێك هاتبوو لە چینی (شودرا) و (مەنبوز) ئەمانەیش ـ بە پێی بیروڕای ئاغاکان ـ تەنها بۆ نۆکەریی خولقاون •• !

٤ ـ چین‌و میسر ، وە عـەرەبەکانی پێش ئیسـلام زۆربەی بازرگانییـان کڕین‌و فرۆشتنی مرۆڤ بوو •••» •

## ب ـ بەندە لە ئاینی ئیسلامدا :ـ

ئاینی پیـرۆزی ئیسلام ڕێزی مرۆڤی زۆر گرتـووە ، وە گەیاندوویەتییە ئەوپەڕی ئەو سـنوور •• بەتکـو کردوویەتی بـە (جێ‌نشینی) خوا لـەم سەر زەوییەدا ، واتە کلیلی زەویی دراوەتە دەستی بۆ ئەوەی بە ئازادیی‌و سەربەستیی ژیانی خۆی دەست نیشان بکات لە چوار چێوەی ئیسلامدا •• وە پێویستی بەچی ئەبێت بەژیریی خۆی هەوڵی بۆ بدات بە پێی ڕۆژو کات •

هەروەك ئیسـلام هیچ پارچەیـەکی زەویی یاساغ نەکردووە لـە مرۆڤ ، سەڕای ئەوەیش بەرگریشی نەکردووە لە گەشتی ئاسمانیی •

---

(١) الاسلام والرق • بە پێنووسی مامۆستا ئیبراهیم النعمە •

بەڵێ ٠٠ کاتێ ئیسلام هات نیوە دوورگەی عەرەبیی پڕ بوو لە مرۆڤ‌کردن بە بەندە ، بە جۆرێك کە تەنها بە ناو مرۆڤ بوون ئەگینە لە مافی مرۆڤایەتیی - بێجگە لەوە کە خۆراکێکی سادەیان ئەدرایە بۆ ئەوەی نەمرن - تەواو بێ‌بەش بوون ٠٠!! وە زۆر کەمتر لە ئاژەڵو گیان لەبەرانی‌تر سەیر ئەکران لە جێگاو خۆراکو پشوودانەدا ٠

زۆر جار ئاغـاکەی لەبەر بێ‌تاقەتیی‌و ڕابـواردن ئەی‌کوشتو گۆشتەکەی ئەدا بە دڕوندەو جانەوەر ٠٠! وەیا شەڕە کەڵەشێری پێ‌ئەکرد ، هانی بەندەیەکی تری ئەداو ئەمی پێ‌ئەکوشت ٠٠

ئەم خوو و بـاوە وەنەبێت تەنها شوێنێکی گرتبێتەوە ٠٠ بەڵکـو زۆربەی ناوچەکان ئەمە یاسایان بوو ، بە هەزارەها رامو ژێردەستە کرابوو(١) ٠٠!

ڕێ ئەکەوت تەنهـا مرۆڤێك یا بنەماڵەیەك بە سەدەها بەنـدەی ڕائەگرتو بازرگانیی پێوەئەکردن ٠٠!

لەم کاتەدا گڵـۆپی ئیسلام هەڵکـراو سـۆزو بەزەیی هاتەوە بـە بەندەی کەساسدا ، وە دەستی‌کرد بە تارنانی یاسای بەندایـەتیی‌و سووك‌کردنی لەسەر شانی مرۆڤ بە چەندەها جۆر ٠٠

جارێ بە ناوی (کەفارەت)ەوە ، واتە ئەگەر کەسێك ئەو تاوانانەی بکردایە کە ئیسلام یاسـاغی کردوون ئەبوایـە لە بـاتی تاوانەکەیدا بەنـدەیەکی ئازاد بکردایە ٠٠

---

(١) خاوەنی کتێبی «شبهات حول الاسلام» ئەڵێت :

دەوڵەتی ڕۆمـان بەڵگەو نموونەیە بۆ ئەم کردارە ناپەسـەندە ، چونکە تەنانەت ئەو بەندە داماوانە لە کاتی پشوودانیشدا زنجیریان ئەکردن ٠٠!!

«والذين يظاهرون من نسائهم ثم يعودون لما قالوا فتحرير رقبة من قبل أن يتماسا ...» المجادلة/٣ .

«وما كان لمؤمن أن يقتل مؤمنا الا خطأ ومن قتل مؤمنا خطأ فتحرير رقبة مؤمنة ودية مسلمة الى أهله الا أن يصدقوا فان كان من قوم عدو لكم وهو مؤمن فتحرير رقبة مؤمنة وان كان من قوم بينكم وبينهم ميثاق فدية مسلمة الى أهله وتحرير رقبة مؤمنة ....» النساء/٩٢ .

جاریکیتر بە ناوی فێرکردنی خوێندەوارییەوە ، یا هەر پیشەسازییەك بەکەڵك بێت بۆ وڵاتو کۆمەڵی موسڵمانان .

هەروەك موسڵمانەکانی هان ئەدا بۆ ئازادکردنیان ..

«فلا اقتحم العقبة وما أدراك ما العقبة فك رقبة» البلد/١١ ، ١٢ ، ١٣ .

لەولایشەوە پێویستی کردە سەر ئاغاکەیان کە هەر کات بەندە داوای نووسینی کرد بۆ ئازاد بوون ئەبێ بە گورجی بۆی بنووسێت .

«والذين يبتغون الكتاب مما ملكت أيمانكم فكاتبوهم ان علمتم فيهم خيرا وآتوهم من مال الله الذي آتاكم ...» النور/٣٣ .

بێجگە لەمانەیش هەر دەوڵەت خۆی دەستی دایە بەندە کرینو ئازادکردنی بۆ ئەوەی بەڵکو قەلاچۆی کرینو فرۆشتنی بەندە بکات .

بەڵێ : ئیسلام بەمە هەموو سەرچاوەکانی پەیدابوونی بەندەی وشك‌کرد .

مەگەر یەك سەرچاوە مابێتەوە ، ئەویش دیلی جەنگە ، ئەمەش دیارە لە دەسەلاتی ئیسلامدا نییە ، چونکە هەروەك موسڵمانان لە کافران دیل ئەکەن لەولاشەوە کافران لە موسڵمانان دیل ئەگرن .. جا جێگەی تانەو تەشەر نییە دوژمن موسڵمانەکان بکاتە بەندەو ئێمەش کافران ئازادکەین .. ؟!

لەگەڵ ئەمەیشــدا کە بەندایەتیی هەڵنەوەشــاندووەتەوە زۆر بــە چاوی ڕێزەوە سەیری بەندە ئەکات ‎٠٠‎ ئەی‌کات بە سەرکردەو پێشەوا ‎٠٠‎ وەك (زەیدی کوڕی حارثە) خوای لێ ڕازیی بێت ‎٠٠‎

کەوابوو بەنــدایەتیی لە ئیسلامدا ناچارییــە ‎٠٠‎ واتە وەنــەبێت ئیسلام پێخۆشحــاڵ بێت پێیی ‎٠٠‎ وەك ناچاریشــە ، ئەوپــەڕی مافو ڕێزی بــۆ دیاری کردووە ، بەڵکو داوای کــردووە لە گەورەکەی لە خواردنو خواردنــەوەو جلو بەرگدا لە خۆی جیای نەکاتــەوە ‎٠٠‎ وەك ئەم فەرمــوودە شیرینــەی پێغەمبەرە ـ صلى الله عليه وسلم ـ کە ئەفەرموێ :

**«اخوانكم خولكم ، فمن كان أخوه تحت يده فليطعمه مما يطعم ، وليلبسه مما يلبس ، ولا تكلفوهم ما يغلبهم فان كلفتموهم فاعينوهم»(١) ٠**

واتە : براکانتان خزمەتچیو کارگوزاری ئێوەن [بە مانای ئەم بەندانە بە چاوی برایەتیی تەماشایان بکەن لە هەموو مافێکدا] ٠

ئینجا هەرکەس «برا»کەی ـ کە بەندەکەیەتی ـ لەژێر دەستیا بوو با خۆی چی ئەخوات هەر لەوەش بدات بەو ‎٠٠‎ وە هەرچی ئەکاتە بەر با لەوەیش بۆ ئەو بکات [واتە : بێ جیاوازیی خستن] وە مەیانخەنە ژێر باری قورس ، ئینجا ئەگەر ئیشتان بەسەرادان یارمەتییان بدەن ٠

پێغەمبەری ئازیزمــان ـ صلى الله عليــه وسلم ـ لــە فەرموودەکەیــدا وای لێك داوەوە کە ئەو بەندانە برای ئێوەن ‎٠٠٠‎! نەك بەندەن ٠

واتە بــە وشەی (برا = أخ) لێکی داوەوە تا بەندەکان خۆیان بــە زەبوون سەیر نەکەنو ئەمانیش ـ گەورەکانیان ـ لە خۆیان بایی نەبن ٠

---

(١) بوخاری گێراویەتییەوە ٠

بەندە ئەگەر ڕاگیرا ـ با بەناچاریش بێت ـ پێویستە بەم جۆرە مامەڵەی لەگەڵ بکرێ .. سەرەڕای ئەوەیش ئەبێ گوێڕایەڵی بکرێ ئەگەر کرا بە فەرماندەو پێشەوای گشتی ..

«اسمعوا وأطيعوا وان استعمل عليكم عبد حبشي رأسه كالزبيبة مادام فيكم كتاب الله»(١) .

ئەگەر بەندە ئا بەو جۆرە سەیر بکرێ ... ئەبێ لە مافدا چ جیاوازییەکی هەبێ لەگەڵ مرۆڤی سەربەستدا ..؟!

کەوابوو بەم وتوو وێژەی سەرەوە ڕوون بووەوە کە بەندە ڕاگرتن لە ئیسلامدا ناچارییە .. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەوەتە بەو جۆرە هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئەکرێ و یاسای پڕ لە سۆزی بۆ دیاریی کردووە .

بە کورتی :

لەو ڕۆژەدا کە ئیسلام چارەسەریی مەسەلەی بەندەیکرد ، ئەم ماف و چارەسەرییە نەئەهات بە بیری هیچ کەسێکا .

بەڵکو هەر بە شتیش دانەئەنرا تا چارەسەری بۆ دابنرێ ..!!

وە هەروەها ئایینی پیرۆزی ئیسلام ـ هەروەك لەگەڵ بەندەدا ئا بەو جۆرە ئەجووڵێتەوە ـ لەگەڵ دیلیشدا زۆر بە سۆزو بە بەزەییە .. ئەوەتە خوای گەورە ـ جل جلاله ـ وەسفی موسڵمانان ئەکات سەبارەت بەوەی چاك ڕەفتار ئەکەن لەگەڵ دیلەکاندا .

«ويطعمون الطعام على حبه مسكينا ويتيما وأسيرا انما نطعمكم لوجه الله لا نريد منكم جزاء ولا شكورا» الانسان/ ٨ ، ٩ .

---

(١) ئیبن ماجە گێراویەتییەوە .

هەروەك پێغەمبەری خۆشەویستمان محمد ـ صلى‌الله عليه وسلم ـ ئاموژگاری
داوەتە بەسۆزەکانی ئەکات بەوە کە چاك ئەجوولێنەوە لەگەڵ دیلەکانیاندا :
«أحسنوا اسارهم» ٠

موسڵمانان ئـاوا ئەجوولێنـەوە لەگـەڵ دیلەکانیانـدا ٠٠ ئـەی خۆ وەك
(ناپلیۆن) ـ داواکەری مـافی ئادەمیزاد لە شۆڕشی فەرەنسەدا ـ ناکات کـە بە
جارێك (٤) چوار هەزار دیل بکوژێ ٠٠!! ٠

یا وەك (ریتشارد)ی ئینگلیزیی لە بەردەم (بيت المقدس)دا (٣) سێ هەزار
دیـلی موسـڵمانی کـوشت ٠ ئیتـر با سەر باشـقەی هەمـوویـانبێ بڕیـارەکەی
(مونتسکیو)ی فەرەنسیی کە ئەی‌ووت : «بەندە خاوەنی گیان نییە ٠٠» !! ٠

بەندە ئا بەو جۆرە بوو تا لە سەدەی نۆزدەهەم‌و بیستەم ٠٠ بێ ماف ٠٠
بێ سۆز بەرامبەری ٠٠ ! تـا ڕۆژ ئاواییەکان بیریان کردەوە بۆ لەنـاو بردنی
یاسای بەندایەتیی ٠٠ بەڵام بەداخەوە لە جێگەی ئەودا جیاوازیی ڕەگەزپەرستیی
دروست بوو لە نێوان سپی پێست‌و ڕەش پێستدا وەك «ئەوەی فەرەنسە کردی
بە موسڵمانە ڕۆژئـاواییەکان ، وە یـا ئینگلیز بـە دوو ڕەنگەکان لـە باکوری
ئەفەریقادا مەگەر هەر خۆیان کردبێتیان» ٠

ئیتر ئەمەریـکا لەبـاس نـابێت ، ئەمەریـکای پێشکەوتووخـواز ٠٠٠!!
ئەمەریکای وێردی سەرزاری زۆربەی لاوەکان !

بەڵێ ٠٠ ئـەوی سپی پێستە خاوەنی ڕێزو پلەیە ، وە بـە چاوێکی پڕ لە
سۆزەوە سەیر ئەکرێ ٠٠ کەچی ئەوی ڕەش پێستە زۆر بێ نرخ‌و بێ‌ڕێزە ، وە
بە هیچ جۆر یەکسانیی لە نێوانیاندا نییە ، با هەردووکیشیان ئەمەریکیی‌بن ٠

سەرەڕای ئەوەیش هێندێ لە ولاتە یەکگرتووەکان جۆرە یاسایەکی سەر
سوڕهێنەریان هەیە کە ویژدانی مرۆڤایەتیی‌و ژیریی ساغ ئێقی لێ‌ئەکاتەوە ٠٠!

یاساکە ئەڵێت :ـ

هـەر ژنو ژن خواسـتنێك رێكبـكەوێ لـە نێـوان سـپی پێستو رەش پێستێکدا ، ئەوە بە پێی یاسای میری ئەو «عەقدە» بەتاڵو نارەوایە ‎••» !!

بێجگە لەمانەیش خۆ ئەگەر کەسێك هەڵسێ بە داوای مافی یەکسانیی لە بەردەم یاسادا ئەوە سزا ئەدرێ بەم جۆرەی خوارەوە :

١ ـ ئەبێ (٥٠٠) پێنج سەد دۆلار بدات بە دەوڵەت •

٢ ـ یا (٦) شەش مانـگ بەند بکرێو بەندیخانـە ببینێ •• خـۆ ئەگەر میری ئارەزووی هەبێ بە هەردوو شێوەکە سزای ئەدات(١) •

---

(١) المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية/دکتۆر عبدالكريم زەیدان ، ل٤١ چاپی پێنجەم •

## دووەم : سەربەستیی لە ووتەو رادا :

لە ئایینی ئیسلامدا هەموو مرۆڤێك سەربەستە بیروڕای خۆی دەربڕێ بێترس‌و بیم ·· هەروەك بڕێ دەیە لە سنووری ئەردانداان بە چاکەو دوورەپەرێزیی کردن لە خراپەدا رەخنە بگرێت لە هەر مرۆڤێك ·· لە گەورەترین تا بچووکترین ئەندامی کۆمەڵ · وە ئەتوانێ رەخنە بگرێت لە پێشەواو سەرۆك ·· بە مەرجێ رەخنەکەی بەرژەوەندی تێدابێت ـ لەمەدا پیاوو ئافرەت یەکسانن ـ بۆ نموونە :

یەکەم : ئەوەبوو (سەلمانی فارسی) رەخنەی گرت لە ئەمیری موسڵمانان (عومەری کوڕی خەتتاب) لە ووتاری هەینیدا ، لە کاتێکدا لە (یەمەن)ەوە ئەندازەیە قوماش هاتبوو بە دیاریی ·· ئەمیریش هەڵسا بە دابەش‌کردنی بەسەر موسڵمانەکانی مەدینەدا ·· هەریەکەیان پارچەیەکیان بەرکەوت ·

رۆژێك خەلیفە ـ عومەر ـ چووە سەر دوانگە بۆ ووتاردان ـ ئەو رۆژە دووپارچەی لە بەرابوو لەو پارچەیە ـ فەرمووی : موسڵمانەکان ـ خوا لێتان رازی بێت ـ گوێ بگرن ، لەناو موسڵمانەکاندا (سەلمان) هەڵساو دووجار ووتی : بەخوا گوێ ناگرین ـ خەلیفە هیچ خۆی لێل نەکرد بە ئارامێکەوە فەرمووی : ئەبوو عەبدوڵلا بۆ گوێ ناگرن ··؟! سەلمان : چۆن گوێ بگرین ···؟! تەنها پارچەیە قوماشمان بۆ هات ، ئەویش ئەوەتە دوو پارچە بەر تۆ کەوتووە ·· کەچی ئێمە یەکی پارچەیەکمان بەرکەوتووە ··! [واتە ئێمە بە پێی بەرنامەی ئیسلام لەسەرمان نییە گوێ رایەڵی ئەمیرێك بکەین کە گزیکاریی بکات لە خەڵك] ·

عومەر ـ (زۆر لەسەرخۆ فەرمووی) : کوا عەبدوڵلای کوڕی عومەر ؟

عەبدوڵلا ـ ها ئەممە ئەمیری موسڵمانان ·

عومەر ـ ئەم پارچەیە هەمووی هیی منە ·· یا نەء ··؟

عەبدوللا ـ نەخێـر هەردووکیان هیی تۆ نییە ، بەڵکو بەشـێکی هینی منە داوەمە بە تۆ ·

عومەر ـ ئەبوو عەبدوڵلا پەلەتکرد لە ئیشەکەدا ، چونکە من سیپاڵەکانم شۆڕبوو ·· عەبدوڵلاش پارچەکەی خۆی بۆ هێنام بە خواستن ·

سەلمان ـ کەوابوو ئێستا گوێ ئەگرین و فەرمانبەردار ئەبین(١) ·

دووەم : ئافرەتێـکی قوڕەیشیی رەخنـەی گرت لـە ئەمیـری موسلمانان (عومەری کوڕی خەتتـاب) ·· کاتێ خەلیفـە چـووە سـەر (دوانـگە = منبر)و فەرمووی : «مـارەیی ئافرەت لە چوارسـەد درهەم نابێ زیاتـر بێت ، وە ئەگەر هاتوو زیاتر بێت لێی ئەسەنرێتو ئەیخەمە (بیت المال)ەوە ·· خەلیفە لە ووتار بوودەوە لـە دوانگە دابەزی ·· دەست بەجێ ئافرەتێکی قـوڕەیشیی بەرەنگاری وەستاو [بۆ داوای مافی خۆیو هەموو ئافرەتانی جیهان] ووتی :

چۆن دەسکاری مافی ئێمە ئەکەیت لە کاتێکدا ئێمە خوا مافی بۆداناوین ··؟!

خوا سنووری مارەیی دیاری نەکردووە ، واتـە نەیفەرمووە تا ئەوەندە ئەبێتو زیاتر لەوە نابێت ·· کەوابوو تۆ چۆن سنووری بۆ دائەنێیت ··؟ ئەها خوای گەورە ئەفەرموێ :

«وان أردتم استبدال زوج مكان زوج وآتيتم احداهن قنطارا فلا تأخذوا منه شيئا ···» النساء/٢٠ ·

---

(١)اقباس من خلفاء الراشدين/صلاح‌الدين مجيد ل٧١ـ٧٢ ·

ئەوەی وەرگێڕ لەم ڕووداوە ئەمەیە : هەر مرۆڤێك ـ مووچە ـ خۆر بێت ، سەرەك دەوڵەت بێت ـ گزی تەنها پەڕەیە کاغەز بکات ئەوە گوێ ڕایەڵیمان لەسـەر نامێنێ بەرانبەری · واتـە ئەبێ سەرپێچی بـکەین تا ڕاست ئەبێتەوە ·

واته : ۰۰۰۰ وه دارایيـه‌كی زۆرتان كردبوو به ماره‌یی یه‌كێكیـان لێی وه‌رمه‌گرنه‌وه ۰ واته ووشه‌ی «قنطار» مانای دارایی زۆرو بێسنووره ۰

ئینجا حه‌زره‌تی عومه‌ر ده‌ستی شه‌رمه‌زاریی به‌رزكرده‌وه‌و فه‌رمووی :

(خوایا لێم ببووره ، هه‌مووكه‌س له عومه‌ر شاره‌زاتره به ئایین ، عومه‌ر هه‌له‌ی كردو ئافره‌تێك هه‌قی دۆزییه‌وه) ۰

ئیتر خه‌لیفه ده‌ست به‌جێ گه‌ڕایه‌وه سه‌ر دوانگه‌و فه‌رمووی :

«به‌رگرییم كردن له‌وه‌ی كه نابێ ماره‌یی ئافره‌ت له چوارسه‌د درهه‌م زیاتر بێت ۰۰۰ بـه‌لام هه‌ركه‌س بـه ئاره‌زووی خۆیـه‌تی چه‌نـد ئه‌كات بـه ماره‌یی بیكات ۰۰»(۱) ۰

خوێنه‌ری خۆشه‌ویست :

سه‌ربه‌ستیی ووته‌و ڕا هه‌روا ئه‌بێت بۆ گه‌ل‌و كۆمه‌ل به پیاو‌و ئافره‌تیه‌وه۰۰ گوێت لێبوو سه‌لمان چـۆن ووته‌كه‌ی بری بـه ئه‌میری موسـلمانان ۰۰؟! وه یا ئافره‌ته قوره‌یشییه‌كه چۆن یه‌خه‌ی عومه‌ری گرت‌و مافی خۆی پێسه‌لماند ۰۰؟ ۰ ئه‌مه‌یه سه‌ربه‌ستیی‌و ئازادیی ئافره‌ت ، ئه‌وه‌بوو بێپێشنیارو پاڵه‌په‌ستۆ خۆی گه‌یانده ئه‌میری موسلمانان‌و مافی خۆی داواكرد ۰

ئه‌م ڕووداوه ئه‌بێتـه سه‌رمه‌شق بۆ هه‌مـوو ئافره‌تانی جیهـان‌و ده‌رزیان دائه‌دات كه نابێ لـه ئاستی ڕاستیی‌و هه‌قـا شه‌رم بكه‌ن‌و مافی خۆیـان پێشێل بكه‌ن ۰۰ ته‌نانه‌ت بـا سه‌ره‌ك ده‌ولـه‌تیش بێت ، ئه‌بێ هـه‌ركات ڕاستیی هاته مه‌یدانه‌وه ووته‌كه‌ی پێببڕن‌و نه‌هێڵن بستێك به‌سه‌ریا بڕوا ۰ مرۆڤ ئه‌توانێ له ئیسلامدا ڕای خـۆی ده‌ربـڕێ له هـه‌ر مه‌سـه‌له‌یه‌كی زانیـاریی‌و ئابووریی‌و رامیارییدا ، وه هه‌روه‌هـا بۆی هه‌یه ڕووبه‌ڕووی گه‌وره‌ترین پیـاوی ده‌وله‌ت

---

(۱) فقه السنة ، به‌رگی دووه‌م ، ل۱۵۸ ، چاپی یه‌كه‌م ۰

بووەستێ بەو مەرجە مەبەستی خێرو چاکە بێت ٠

«وە هەروەهـا مرۆڤ بۆی هەیە رەخنـە بگرێت لە پێشەوای نوێـژ کاتێ هەڵەی کرد لە کردارو هەڵسوکەوتی نوێژەکەی ، واتە کاتێ پێشەوا هەڵەی کرد نابێ خەڵکەکەی تـر دوای بکـەونو گوێ بە هەڵـەکەی نەدەن ٠٠ تـا ئـەویش خۆیشیوو کۆمەڵ بەقڕ بدات ٠ بەڵکو ئەبێ ڕای چلەکێننو لە هەڵەکەی ئاگاداری بکەن ٠٠! ئیتر لەمەدا پیرو لاوو منداڵو پیاوو ئافرەت یەکسانن»(١) ٠

ڕابـەرە خۆشەویسـتەکەمان موحەممـەد ـ صلى‌الله علیه وسـلم ـ لەسەر مەشرەتو ڕاوێژ هاوەڵەکانی پەروەردەکرد ٠٠ بەڵکو زۆرجار ڕایان جیاوازبوو لەگەڵیا ، وە پێغەمبەر دەسـتی لە ڕاکەی خـۆی هەڵئەگـرتو ئەڕۆیشـتە سەر پێشنیارەکەی ئـەوان ، چونکە بەرژەوەنـدیی ئیسلام لە ڕای ئەوانـدا بەرچاو ئەکەوت ، جا بۆ نموونە فەرموو تۆو ئەم خالانە :ـ

١ ـ لە جەنگی (بەدر)ی گەورەدا بوو موسڵمانەکان هاتن لە خوارووی بەدرەوە دابەزین ، بە جۆرێك ئاوەکە لە قورەیشییەکانەوە نزیکتر بوو ٠ لێرەدا (حباب)ی کوڕی مونزری مەدینەیی کە شارەزای شوێنو جێگاکە بوو هاتو ووتی :

ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەم شوێنە بە فەرمانی خوا تیا دابەزیویت ، یان ڕاو جەنگو فێڵە ٠٠؟

فەرمووی ڕاو جەنگو فێڵە ، وتی : دەی کەوایە ئەم شوێنە باش نییە بفەرموو با بڕۆین هەتا ئەچینە سەر ئاوەکەو ئەکەوینە ناوەندی ئاوەکەو قورەیشییـەکان ، من ئەزانم ئـاوەکە زۆرە ، وە بیـرو حەوزی خڕمـانی لێ پڕ ئەکەینو ئەوان بەبێ ئاو پەکیان ئەکەوێ ٠ پێغەمبەر ـ صلى‌الله علیه وسلم ـ

---

(١) العبادة فى الاسلام ، ل٢٢٨ ، دکتور یوسف القرضاوی ، چاپی شەشەم ٠

فەرمووی ڕاکەت زۆر جوانە ‥ ئینجا فەرمانیدا چوونە سەر ئاوەکەو حەوزیان لێ دروست کردوو ئەویتریان داپۆشی ‥‥»(١) ٠

دەبا هەموو جیهان گوێی تێوەبێت ‥ ئایا تا ئێستا سەرکردەو فەرماندەی ئاوای بینیوە ‥‥ ؟ بیستوویەتی پێشەوا گوێڕایەڵی سەربازبێت ‥؟ یاخێر ‥ سەرباز ئەوێری دەم بدرێتەوەو ڕەخنەبگرێ لە بچوکترین پایەدار تا گەورەتر ‥؟

ئایا هەموو کەس نازانێ سەرباز دە ئەوەندەی ئەفسەرەکەی بزانێ کەس پرس و ڕای پێناکاتو قسەیشی ڕەواجی نییە ‥ چونکە بڕوانامەی نەهێناوە لە کولێجی سەربازییدا ؟! ٠

کەواتە با هەموو جیهان شایەتی پاکیو ڕاستیو ئازادیی خوازیی تۆ بدات ئەی نێرراوی خوای گەورە بۆ هەڵگرتنی ئاڵای ئازادیی ٠

دەبا هەموو ئازادییخوازان چاو ببڕنە تۆ ئەی تاکە چرای بەختیاریی ٠

٢ ـ لە جەنگی (چاڵ = خندق)دا :

کاتێ هۆزە ناپاکەکان ویستیان هێرش بێننە سەر مەدینە ، پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ کەوتە ڕاوێژکردن لەگەڵ موسڵمانەکاندا : کە لە شارا دابنیشن ، یان بچن بۆ ڕێگایان ‥؟ لە ئەنجامدا بڕیاریاندا کە لەناو شارا بمێننەوە ، (سەلمانی فارسی) ووتی :

با لە دەوری مەدینەدا چاڵ هەڵکەنینو ڕێگەیان نەدەین بێنە ناوشار ، ئەم ڕایە پەسەند کراو بە گورجیی دەستیان کرد بە چاڵ هەڵکەندن ‥

ئەی پێغەمبەری گەورەی ئیسلام دەبا هەزارەها وەك من لە دەوری خۆتوو ئایینەکەت گەڕێ ‥‥ ، ئایینی دوور لە ڕەگەزپەرستییو ئاوو خاکو تیرەو عێل

---

(١) ژیانی پێغەمبەری مەزن (محمد) ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ بەرگی یەکەم لە نووسینی خوالێخۆشبوو مامۆستا عبدالعزیز پارەزانی ٠

بۆ یەکێك لە هاوەڵەکانت نەیووت چۆن ڕای ئەو ـ سەلمان ـ پەسەندە لە کاتێکا خەڵکی ئێرە ـ مەدینە ـ نییەو بە نەژاد عەرەب نییە ؟ نەبێ ئەوەش بزانین کە هاوەڵەکانی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ کاتێ ڕای خۆیانیان دەرئەبڕی کە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ وەحیو نیگای بۆ نەهاتایە دەربارەی ئەو کارەو بەڕای خۆی بیکردایە •

لە دەربڕینی ووتەو ڕادا پێویستە ئەم خاڵانە پێش چاو بگیرێن :ـ

١ ـ مەبەستی دەرکەوتنی هەقو ڕاستیبێ •

٢ ـ مەبەستی خۆهەڵکێشانو شکاندنی ئەموئەو نەبێت •

٣ ـ مەبەستی ئەوە نەبێت بەو ووتەیە بگات بە پایەیەکی دنیایی ، وەیا دەست کەوتێك •

٤ ـ ڕێبازو بیروباوەڕی ئیسلام بگرێتە پێشچاو ، کەوابوو نابێ لە پاڵ سەربەستیی ووتەو ڕادا ووشەی ناشیرین ئاراستەی ئیسلام بکات •

٥ ـ ئەبێ ئاگاداری ماناو مەبەستی خووڕەوشت بکرێ •• کەوابوو نابێ هەستی خەڵك بریندار بکرێو قسەی ناشیرینیان تێگیرێ لە پاڵ سەربەستیی ووتەدا ••(١) •

خوێنەری بەڕێز :ـ

بەڵگە زۆرە زۆرە بۆ سەربەستیی ووتەوڕا لە ئیسلامدا بەلام با بەسبێت ، چونکە ئەو کەسە بەمانە قایل نەبێت ، بە هیچ تۆز ناناتو هەق وایە خۆتی پێوە خەریك نەکەیت •

---

(١) مجموعة بحوث فقهية ، ل١٣ ، دكتور عبدالكريم زيدان •

## سێهەم : سەربەستیی لە وەرگرتنی ئایینـدا (حرية التدين) :

هەموو مرۆڤێکی خاوەن ئایینو بەرنامە ـ واتە ئەوەی لە ئاسمانەوە کتێبی بۆ هاتبێ ـ بۆی هەیە لەژێـر سێبەری ئالآی دەولـەتی ئیسلامدا بـە ئازادیی و سەربەستی بژی ، وە فەرمانی ئایینەکەیشی ببا بەڕێوە ، بە مەرجێ بە ئاشکرا هەڵنەستێ بەو کارانەی پێچەوانەی بەرنامەی ئیســلامەن ، هەروەك بۆی هەیە بە ئازادیی یاسای (تەلآق ، نیـکاح ، میراتو ... هتد) ببـا بە ڕێوە بـە گوێرەی ئایینەکەی خۆی .

وە لە فەرمانە گشتییـەکانا (الوظائف العامة) دائەمەزرێن ، بـەو مەرجە جێگەی باوەڕبنو شـانیان ئەو ئیشــە هەڵبگرێ ، زانـاکانیش تەماشـای ئەم یاسایەیان کردووە کە ئەڵێن :

کاروباری وەزارەتی ڕاپەڕاندنیان (وزارة التنفيذ) پێ ئەسپێررێ ، وە ئەم وەزیری ڕاپەڕاندنـە هەموو بڕیارێکی سەرەك دەوڵەت (امـام ، رئيس الدولة) ڕائەپەڕێنێ ، ئەمەیش لە یاسای تازەی دەوڵەتانا وەك مەڵبەندی وەزیران وایە کە هەڵئەسـن بە ڕاگەیاندنی بڕیارەکانی کۆڕی وەزیران .

بەڕاستی ئـەم چاوپۆشییو دادو سـۆزە تەنها لە ئیســلام دێت .. تەنها ئیسلامە کە بزانێ فـلآن کۆمەڵ ناحەزە بە یاساو ڕژێمەکەی کـەچی هێشتا لە فەرمانە گشتیەکانا بەشداری بکاو دایمەزرێنێ ....!! ئەمە تەنها لە ئیسلام دێت ، چونکە ئـەو دەوڵەتانە کە خاوەنی بیـرو بڕواو بەرنامـەن ـ وەك دەوڵەتە شیوعییەکان ـ هەرگیزاو هەرگیز کاروباری دەوڵەت ، وە فەرمانە گشتییەکان بە دەست کەسێکەوە نادەن کە (شیوعی) نەبێت . با لە ژێر ئالآی ئەویشدا بژی، تەنانەت با ددان بنێت بە یەکسانییدا لە نێوانیاندا لە مافە ڕامیارییەکانا ..

(الحقوق السياسية)(١) ٠

ئەم ئازادیی‌و سەربەستییە بەم شێوەیە کە جوولەکەو گاور (سەرانە = جزیە)(٢) بدەن بە دەوڵەتی ئیسلام ، ئەویش بەم پێیە پێویست ئەبێ :

١ ـ ئەو کەسە ئەبێ نێرینە بێ ٠٠٠ واتە پیاو نەك ئافرەت ٠

٢ ـ دارای ئەقڵ‌و ژیریی بێت ٠

٣ ـ کوێر نەبێت ٠

٤ ـ بیرو نەخۆشی هەموو کاتیی نەبێت ٠ کەوابــوو پیرو کوێرو پەككەوتوو لە سەر جێگە سەرانەیان لەسەر نییە(٣) ٠ هەروەك لەسەر ئافرەت‌و منداڵ‌و شێت‌و نێرەمووك (خنثی) نییە ٠

٥ ـ ئەبێ ئازاد بێ ٠٠٠ کەواتە لەسەر بەندە نییە ، چونکە خاوەنی ماڵ‌و سامان نییە ٠

٦ ـ ئەبێ دەسەڵاتداربێ ٠٠ کەواتە هەژارو بێ‌نەوا سەرانەیان لەسەر نییە ٠

جا دوای عەقدی جیزیە بەم مەرجانە باس‌کران پێویستە لەسەر موسڵمانان بە هیچ جــۆرێ دەست درێژیی نەکەن بۆ گیــان‌و نامووس‌و ماڵیــان ، وە هەر شتێکیان بفــەوتێنن لــە گیان‌و مــاڵ‌و نامــووس‌و (اختصاصات) ئــەبێ حــەقی شەرعییان بدەینێ ، وە دەفعی شەڕکەریان لێ‌بکەین ٠

---

(١) احکام الذمیین والمستامنین فی دار الاسلام ، ل٨٠ـ٨٣ ، دکتور عبدالکریم زیدان ٠

(٢) جزیە ئەوەیــە : کــە پێشــەوای موسڵمانــان ، یــا جێ‌نشینی ئــەو بڵێ ئەتانهێڵمەوە لە (دار الاسلام)دا ، بەو مەرجە کە هەموو ساڵێ جیزیە بدەن‌و فەرمانی ئێمە جێ‌بەجێ بکەن ٠ وە لای کەمی جیزیە (مثقالێك ئالتوون)ە ٠

(٣) احکام الذمیین والمستامنین في دار الاسلام ، ل١٢٢ ٠

## بۆچی سەرانە دانراوە ٠٠ ؟

بە پێویستی ئەزانم لێرەدا هەندێك لـە جیزیە بدوێین ، چونکە دوژمنانی ئیسلامو ئەوانـەی چاویان بڕیوەتە بـەروبوومی ولاتی ئیسلام بە هەمـوو جۆر خەریکن بۆ ئاژاوە نانەوەو فریب دانی کۆمەڵو گەل ، بە هەر فڕوفێڵێك بووە ، هەر وەك چەندەها گومانو ڕەخنەی بێجێ ئاراستەی ئیسلام ئەکەن ٠٠!

أ ـ بە چینی «کرێـکار = پرۆلیتاریـا» ئەڵێن : لەگەڵمـانبن جـا دوایی چەندەها کارگەتان بۆ ئەکەینەوەو دەوڵەمەن ناهێڵین بمێنێ ، واتە ئەبێ هەموو کەس وەکو یەك بژین ، کەس لە کەس سامانی زیاتر نەبێ ٠

ب ـ بە جووتیار ئەڵێن : «پشتگیرمـان بن جا لە پاشـەڕۆژدا دەرەبەگ ئەرخێنینو زەویو زارەکەیان دابەش ئەکەین بەسەرتانا» !

ج ـ بە قوتابییەکان ئەڵێن : «یارمەتیمان بدەن ٠٠ تا ڕۆژی خۆی دێت ئەو کاتە پلەو پایەی بەرزتان ئەدرێتێ ٠٠!»

د ـ دەسـتی لاوەکانیش بەم جۆرە ئەبـڕن : «پاڵپشـتمانبن سەرئەنجام گەلێکی ئازادو سەربەست واتە (بەرەڵلاو بێئابڕوو) دروست ئەبێتو هەرکەس بە ئارەزووی خۆی ڕابوێرێ ٠ واتە هەموو کەس دەست لە شەرەفو نامووسی بشوات» ٠

ئاگری خەشمو قینی (فەلە)کانیش بەم جۆرە هەڵئەگیرسێنن :

«ئەگەر ئێوە یارمەتیدەرمان بن ڕزگارتان ئەکەین لەو ئیسلامەی کە ژێر دەستەی کردوونو مافی پێشـێل کردوونو جیاوازیی دروست کـردووە لە ناو چینەکاندا ، بەتایبەت ئەو سەرانەی کە خستوویەتە سەر ئەستۆتان ٠٠!! چونکە سەرانە مانای ڕیسواکردنو چەوساندنەوەیە ٠٠٠!»

وەلامی ئـەم ڕەخنە بێجێیەیـان ـ واتە سـەرانە ـ گفتوگـۆی پیاوێکی (فەلەی) ئەورووپییە ٠٠ هەر ئەویش بە باشترین بەڵـگە ئەژمێررێ لای ئەوان

ـ توانج‌گره‌کان ـ چونکه تاوانی لایه‌نگری کردنی ئیسلام ناخرێته ئه‌ستۆی ٠
(سیرت ٠ و ٠ ئارنولد) لـه کتێبی «الدعـوة الی الاسلام» لاپـه‌ڕه (٥٨)دا
ئه‌ڵێت :

«سه‌رانه له باتی خزمه‌تی سه‌ربازیی پێویست کراوه له‌سه‌ر ئه‌و پیاوانه‌ی
که ئه‌توانن سه‌ربازیی بـکه‌ن ـ ئه‌گـه‌ر موسـڵمان نه‌بوونایه ـ واته لـه باتی
ئه‌وه‌ی سه‌ربازیی بـکه‌ن هێندێ سامانیان ئه‌دا به ده‌وڵه‌ت ٠٠ ده‌وڵـه‌تیش به‌و
دارایی‌یه سه‌ربازی ڕائه‌گرت‌و ئه‌ی‌ناردن بۆ پاراستنی ولآت له هاشاوڵی دوژمن ،
خۆ ئاشکرایشه هه‌ر تاقمێکی فه‌له‌یی چووبێته ناو سه‌ربازگه‌ی ئیسلامه‌وه عه‌فوو
کراوه له سه‌رانه ٠٠ وه‌ك هۆزی (جراجمه)کان ڕێکه‌وتن له‌گه‌ڵ موسڵمانه‌کاندا
که یارمه‌تییان بـده‌ن لـه کاتی ته‌نـگانه‌و جه‌نگدا ٠٠ ئیتـر ده‌وڵـه‌تی ئیسلام
سه‌رانه‌یان لێ‌نه‌سێنی‌و له جه‌نگیشدا هه‌رچییان گرت به‌شی ئه‌وانی تیابێت ٠٠!»
وه ناوبراو له لاپه‌ڕه (٥٩)دا ئه‌ڵێت : «جوتیاره میسری‌یه‌کان له سه‌ربازیی
عه‌فوو ئه‌کران ، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌یشدا موسڵمان بوون سه‌رانه‌ی لێ‌سه‌ندن ، هه‌روه‌ك
له گاوره‌کانی ئه‌سه‌ند ٠٠»(١)

که‌وابوو مه‌ســه‌له‌که بێ‌ڕێزیی گاورو جووله‌که نه‌بـوو ـ وه‌ك بیروباوه‌ڕ
نه‌خۆشه‌کان ئه‌ڵێن ـ به‌ڵکو پاراستنی ولآت‌و نیشتمان بوو له هێرشی دوژمن ٠٠
هه‌رکه‌س خۆی توانیبێتی وا خۆی هاتووه‌و خزمه‌تی کردووه ، ئیتر که‌س ناوی
سه‌رانه‌ی لێ‌نه‌بردووه ٠٠٠ ئه‌گینـه سه‌رانه‌یان لێ‌سه‌ندووه‌و سـه‌ربازی تریان
پێ‌ڕاگرتووه بۆ پاراستنی ئه‌و خاکه‌ی هه‌ردووکیان ـ موسڵمان‌و گاور ـ له‌سه‌ری
ئه‌ژیان به هاوبه‌شیی‌و دوور له جیاوازیی ٠

نموونه‌یه‌کی سه‌ربه‌ستی له خوا په‌رستییدا :ـ

«کاتێ موسڵمانه‌کان شـامیان گـرت‌و خستیانه ژێر ئـاڵای پاکی پیرۆزی

---

(١) (شبهات حول الاسـلام) وه (احكام الذميين والمتامنين فی دار الاسـلام ،
ل١٤٣ـ١٤٧ ٠

ئیسلام لە پایتەختی شامدا مانەوە ‥ وە کاروباری دەزگای دەولەتی (فەلەیی) درایەوە دەست خۆیان ‥ وە سەربەستکران چی ئەکەن بیکەن ‥! بەلام شارەکە بوو بە دوو بەشەوە :ـ

بەشێکی بێ جەنگوهەرا خۆی دابەدەستەوە‥ئینجا دەولەتی ئیسلام سەرانەی لێسەندنو لەسەر ئایینی خۆیان مانەوە ، وە بە پێی یاسای ئیسلام ئەم جۆرە گرتنانە ئەبێتە هۆی ئەوە کە هەرچییان هەیە ببێتە مالی موسلمانان ٠ کەچی لەگەل ئەوەیشدا چاوپۆشییان لێکراو ئیسلام هەلینەفراندنو چی دارایی‌و کەنشتە بوو لەگەلی کردن بە دوو بەشەوە ‥ هەروەك گەورەترین کلیسە لە شامدا کلیسەی (قدیس یوحنا) بوو لەگەلیان کرا بە دوو بەش لایەکی گاورەکان خواپەرستی خۆیانیان تیائەکرد ‥ موسلمانەکانیش لەولاکەی تریا ‥»(١) ٠

خەلکی تریش بافیش ئەکاتو ئەلێت سەربەستیی بیروبڕوامان لایەو ڕێزی «ئایینداریی» ئەگرین ‥ کەچی بێ شەرمانە (٣٠) سی هەزار مزگەوت ئەڕووخێنیو جێگاکانیان ئەکات بە (تیاترۆخانە ‥‥)(٢) یا «چینی» ناپیاو داوای مافی میللیی ئەکات ‥! کەچی (٢٠) بیست هەزار مزگەوتی موسلمانەکانی (ترکوستان)ی ڕووخاند ‥!»(٣) ٠

یا وەك مامۆستا (شێخ موحەممەدی خالد) ئەلێ : «ئەوە شیوعییەکان لە وولاتی خۆیانا کارتی «تەموین» نادەن بە بڕواداڕەکان ، تا بمرن لە برسانا ، یا بێبڕوا ببن بە خوا ، یا دەست لە خوا پەرستیی هەلگرن ‥»(٤) ٠

---

(١) اشتراكية عمر ، بەرگی دووەم/مەحمود شەلەبی ٠

(٢) الاسلام يقينا لا تلقينا ، ل٢٥٤ ، دكتور صابر طعيمة ٠

(٣) الاسلام يقينا لا تلقينا ، ل٢٦٩ ، دكتور صابر طعيمة ٠

(٤) تەفسیری خالد ، جزئی بیستو هەشتەم ، ل٨٤ ، چاپی یەکەم ١٩٨١ی زاینی ٠

وه هەروەها سەربەستیی ئاقیدەو بیروباوەڕ لە ئیسلامدا تا ئەو سنووره ڕۆیشتووە کە ئەگەر «ئافرەتێکی جوولەکە ، یا گاور پیاوێکی موسڵمان مارەی کرد ‎٠٠‏ ئیسلامییەت ناخرێتە پێش چاوی (واتە پێی ناووترێ وەرە موسڵمان ببە) چونکە ئەم پێ ووتنــە ئەبێتە دەست درێژیی بۆ سەر ئایینو هەسـتیی ، خۆ ئێمەیش ـ موسڵمانان ـ پەیمانمان داوە کــە (تەعرض)یان بۆ نەکەین ‎٠٠‏»(‎١‏) تەنانەت ئایینی ئیسلام قەدەغەی هاتوچۆیان ناکات بۆ کلیسەو خواپەرستگاکانیان بۆ نوێژو جۆری خواپەرستییتر ‎٠٠٠‏ بێجگە لەمەیش ئەتوانێ ـ ئەو ئافرەتە ـ نوێژی خۆی بکات لە ماڵی مێردە موسڵمانەکەیدا ـ (‎٢‏) ‎٠‏

به کورتی :

ئەو کەسەی لەژێر ئــاڵای ئیسلامدا بژی سەربەستیی تەواوی هەیــە لەم مافانەی خوارەوە :

یەکەم : ســەربەستییو ڕێزی خۆیی (شخصی) واتە بە چاوی ڕێــز سەیر ئەکرێ ‎٠‏

دووەم : پاراستنی ڕێزی خانووبەرەی (حرمة السكن) ‎٠‏

سێهەم : سەربەستیی ئاقیدە ، واتە ڕێزی بیروبڕوایان ئەگیرێو زۆریان لێناکرێ بــۆ باوەڕهێنــانو شوێنکــەوتنی بەرنامــەی ئیسلام ، با بــدرێ بە گوێشیانا ‎٠٠‏ چونــکە بانگکردنو زۆرکــردن جێیــان لە یەك ‎٠٠‏ بانــگ کردن ڕەوایە :

«أدع الى ســبيل ربك بالحكمة والموعظــة الحســنة ، وجادلهم بــالتي هي احسن ‎٠٠٠‏»(‎٣‏) ‎٠‏

---

(‎١‏) مجموعة بحوث فقهية ، ل‎٤٩‏ ، دکتور عبدالكريم زيدان ‎٠‏

(‎٢‏) التربية الاسلامية ، ل‎٤١‏ ، ژمارە (‎٦‏)ی ساڵی ‎١٤٠٠‏ کۆچی ‎٠‏

(‎٣‏) سوورەی (النحل) ئایەتی ‎١٢٥‏ ‎٠‏

.. کەچی زۆرکردن لێیان بۆ بڕواهێنان بە ئایینی ئیسلام یاساغە .
«لا اكراه في الدين قد تبين الرشد من الغي ...»(١) .

× × ×

(١) سوورەی (البقرة) ئایەتی ٢٥٦ .

# ئایا دێرو کەنشتەکانیان تازە ئەکرێنەوە ....؟

زانایانی ئیسلام ئەڵێن : شاری موسڵمان نشین (٣) سێ جۆرە :ـ

١ ـ ئەوەیە موسڵمانەکان خۆیان بناغەیـان دانابێ وەکو شاری (بەصرەو کووفەو بەغداو قاهیرە) ئـەوە ئەم جۆرە شـارانە دروست نییە بـۆ جوولەکەو گاور رەنگی کەنشتەو دێری تیا بڕێژن ، بەڵام (زەید)ییەکان ئەڵێن :

ئەگـەر پێشـەوای موسـڵمانان ئیجـازەیدان بـۆ کردنی ، لەبـەر هەر بەرژەوەندییەك خۆی تیا بەدی ئەکرد ئەوە دروستە .

٢ ـ ئەوەیە موسڵمانەکان بە زۆر ئەو شارەیان گرتبێ .. ئەم جۆرەیشیان هەر دروست نییە کەنشتەو دێری تیا دروست بکرێ .. بەڵام هەندێ لە (مالیك)ییەکان ئەڵێن : ئەگەر ئیمام بە باشی زانی دروست ئەکرێ .

٣ ـ ئەوەیە بە رێکەوتن کەوتبێتە ژێر ئاڵای ئیسلام ... ئەمەیش ئەگەر رێکەوتن لەسەر ئەوەی کـە زەوییو زارەکەیان بۆ خۆیان بێتو بـاج (خراج) بدەن بە دەوڵەتی ئیسلام ئەوە لەم بارەدا بۆیان رەوایە کلیسە بکەنەوە .. وە ئەگەر لەسەر ئەوە رێکەوتن کە :

خاکو ئاوەکە هی دەوڵەت بێو ئەوان سەرانە بدەن ئەوە تەماشای رێکەوت نامەکە ئەکرێ : ئەگـەر لە رێکەوتنامـەکەدا بـە مەرجییان گرتبێ بـەرگریی نەکرێن لە دروست کردنی کلیسەو دێر ئەوە بە پێی ئەوە رەفتار ئەکرێ ئەگینە نابێ بیکەن ..(١) .

سەرەڕای ئەمانـەیش خۆیانو ساماانیان ئەپارێزرێت لە هەمـوو دەستێکی چەپەڵ ، تەنانەت ئەگەر لێیان دیلکرا ئەبێ دەوڵەتی ئیسلام هەوڵی رزگارکردنی بدات ، یا هێرشیان بۆ هێنرا ئەبێ یارمەتییان بدات ....!! .

---

(١) احکام الذمیین والمستامنین فی دار الاسلام ، ل٨٧ـ٩٧ بە کورتی وە هەر بۆ ئەم مەبەستە سەیری (شەریعەتی ئیسلام) بکە بەرگی چوارەم ، ل١٨٠ .

برای خوێنەری شیرینم :ـ

کۆتایی ئەم باسەشت بۆ دێنم بــەم فەرموودەی پێغەمبەرە ـ صلى الله علیه وسلم ـ کە ڕووی ووتە ئەکاتە موســڵمانەکانو وەك شتێکی سپاردە جوولەکەو گاور ئەخاتە پێش‌چاویان :ـ

ئاگاداربن هەرکەس (لە ئێوە ئەی موسڵمانەکان) ستەم بکات لەو کەسەی پەیمانی لەگەڵدا بەستراوە ، یا پەیمانەکە تەواو نەکاتو (جەنگی لەگەڵ بکات) وە یا ئیشێکی بەسەروا بدات لە توانایا نەبێت ، یا شتێکی لێوەرگرێ بێ پێخۆش بوونی دەروونی ٠٠ هەرکەس ئاوا بکات ئــەوە من داواچیم لەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا ٠ (واتە داواچی مافی ئەو جوولەکەو گاورە ئەبم لەو موسڵمانە ستەمی لێکردووە ٠٠٠ !!)

## چوارەم : سەربەستیی لە فێربوونی زانستو زانیارییدا

ئایینی بەرزی ئیسلام هەموو مرۆڤێکی ئازاد کردووە ـ خاوەن بڕوا بێ یا نەء ـ کە بە ئـارەزووی خۆی فێری هەموو زانیارییەك ببێت • ئیتـر سوودی گشتیی تیا بێت ، یا تەنها سوودی خۆیی • تەنانەت ئەو جۆرە زانیارییەش کە لە ئیسلامدا یاساغە بەکارهێنانی وەك (جادوو) ئیسلام چاوپۆشیی کردووە بۆ فێر بوونی •• بەڵام بۆ ئەوەنا جادوو بکات لە خەڵکی ، بەڵکو بۆ ئەوە ئەگەر ڕۆژێ داماو جادوویان لێکرد بابزانێ چۆن خۆی ڕزگار بکات •••!!

ئیتر جـۆرەکانی زانیاریی لەمەدا یەکسانن وەك : «ژمێـرەو ماتماتیكو فیزیكو کۆمەڵایـەتییو پەروەردەو تەندروسـتییو دەروونناسـییو ئابووریيو بازرگانییو رامیاریيو پزیشکییو سروشتنـاسییو ڕووەك ناسییو کشتوکاڵو گەردوونناسیی •••) چونـکە بێئەمانە ژیان لەیەك دۆخا ئـەوەستێتو گەشە ناکات •

جا وا بۆ نموونە : چەند ئایەتێك دێنینەوە لە جۆراوجۆری زانیارییدا :

١ ـ زانیاریی ژیوار (بایۆلۆجیا) :

«فلینظر الانسان مم خلق •• خلق من ماء دافق •• یخرج من بین الصلب والترائب ••» الطارق/٥ـ٧ •

٢ ـ دەروون ناسی :

«وفي انفسكم افلا تبصرون ••» الذاريات/٢١ •

٣ ـ مێژوو و کۆمەڵایەتیی :

«أولم يسيروا في الأرض فينظروا كيف كان عاقبة الذين من قبلهم •• كانوا أشد منهم قوة •• وأثاروا الأرض وعمروها أكثر مما عمروها •• وجاءتهم رسلهم بالبينات فما كان الله ليظلمهم ولكن كانوا انفسهم يظلمون ••» الروم/٩(١) •

---

(١) روح الدين الاسلامي ، ل٢٧٦ـ٢٧٧ •

سەرەڕای ئەمانـەیش ئـەم هەموو زانیارییانـەی خوارەوە لـەم یەك دوو ئایەتەی بەردەستتا بەدی ئەکرێن :

«ألم تر أن الله أنزل من السماء ماء فاخرجنا به ثمرات مختلفا ألوانها ومن الجبال جدد بيض وحمر مختلف ألوانها وغرابيب سود ومن الناس والدواب والانعام مختلف ألوانه كذلك انما يخشى الله من عباده العلماء ٠٠٠» فاطر/٢٧-٢٨٠

ا ـ سروشتناسـیی ، چونـکە هاتنـە خـوارەوەی (ئـاو) لە ئاسـمانەوە چۆنیەتییەکەی نازانرێ بەبێ (علم الطبیعة) ٠

ب ـ کیمیاگەریی ٠٠ چونـکە (یەکگرتنو تێـکەڵبوونی ئەم ئـاوە بەبێ زانیاریی (علم الکیمیاء) نازانرێ ٠

ج ـ ڕووەکناسیی ٠٠ چونـکە (ڕووەکو بەرهـەم) بەبێ ( علم النبات ) نازانرێ ٠

د ـ زەویناسیی ٠٠ چونکە (کێوەکانو بـاری یەکگرتنیانو جیاوازییان) بەبێ (علم طبقات الارض ـ جیولوجیا) نازانرێ ٠

ه ـ زانیاریی گەلناسییو ئاژەڵناسیی ٠٠ (علم اصول الشعب والحیوان) چونکە بەبێ وردبوونەوە لە جۆری جیاوازییان لە یەکتر ناناسرێن ٠٠(١)

خۆ ئەگەر سەیری ئەو پیشەسازییانە بـکەین کە بەبێ زانیاریی نازانرێن وەك (ئۆتۆمۆبیلو تانكو فڕۆکەو ڕۆکێتو مووشـەك ٠٠٠) ئەبینین ئیسلام بە پێویستی داناوە لەسەر موسڵمانان فێربوونیان بـۆ پاراستنی خاكو نیشتمانی ئیسلام ، بەتایبەت لەم چەرخی بیستەمەدا کە هەر ڕۆژێ نە ڕۆژێ شتێکی تازە بابەت دائەهێنرێ ٠٠!

«وأعدوا لهـم ما استطعتم من قـوة ومن رباط الخيل ترهبون بـه عدوالله وعدوكم وآخرين من دونهم لا تعلمونهم الله يعلمهم ٠٠» الأنفال/٦٠ ٠

واتە ئەبێ بـە پێی ڕۆژوکات چی دائەهێنرێت کۆمەڵێك تەرخـان بکرێن

---

(١) سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٧٦ ٠

ـ لە لایەن دەوڵەتەوە ـ بۆ فێربوونی دروستکردنی ئەو جۆرە شتوومەکە ٠٠ بۆ ئەوەی وڵاتەکەمان ـ وڵاتی ئیسلام ـ دوانەکەوێو ئێمەیش چاوەڕوانی شتێکی سادەبین لە وڵاتە بێگانەکانەوە بۆمان بێت ٠٠!! ئەوانیش لە باتی ئەوە خوێنمان بگرنو بەرووبوومی وڵاتەکەمان زەوت بکەن ٠٠ دەبێ ئەوەیش بگیررێتە پێشچاو سەبارەت بەو کۆمەڵە تەرخان ئەکرێن بۆ ئەو ئیشەو زۆر جاریش ئەنێررێتە دەرەوە کە تاقمێکی دەستچن بن ٠٠ واتە خاوەن ئایینو ڕەووشتی بەرزبن ، وە جێگەی باوەڕبنو مەتمانەیان پێ بکرێتو بتوانن هەڵسن بەو کارە کە دراوە بەسەر شانیاندا :

«قال اجعلني على خزائن الارض اني حفيظ عليم» يوسف/٥٥ ٠

«ان خير من استأجرت القوي الأمين» القصص/٢٦ ٠

بەڵام داخەکەم لەم وڵاتانی ئێمەوە هەموو ساڵێك تاقمێ ئەنێررێن بۆ فێربوونی پیشەسازییو تەکنەلۆژیا ٠٠ وە لەم ڕێگەدا بە هەزارەها (دینار) سەرف ئەکرێ ، لەولایشەوە موسڵمانەکان چاوەڕوانیانن کە فێری فرۆکەو دروستکردنو داهێنانی هەموو جۆرە چەکەمەنییێكو هەموو جۆرە هونەرێك بن ٠٠ کەچی کاتێ ئەگەڕێنەوە ـ ئەویش ئەگەر گەڕانەوە ـ سەرەڕای ئەوە کە ئایینو مەزەبیان لانەماوە ، وە ڕەوشتی مرۆڤایەتی پێچراوەتەوە لە لایان ، سەرەڕای ئەمانەیش بە دەستی خاڵیو نائومێدی هاتوونەتەوە ٠٠! چونکە کاتێ نێرران دەست چن نەکران سەبارەت بە خووڕەوشتی پەسەند ٠

بێجگە لەمەیش وەکو مامۆستای بەڕێز (شێخ موحەممەدی خاڵ) لە تەفسیری جزمی دووهەمدا چاپی یەکەم ئەڵێ : «زۆر بە داخەوە ئەمە چەند ساڵێکە گەنجەکان کە بۆ خوێندن ئەچنە شارە گەورەکانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا ، لە جیاتی ئەوەی خوێندن بێننەوە ، یەکی ئافرەتێکی بێگانە لەگەڵ خۆیانا ئەهێننەوە ، وە هەموو دینو نیشتمانییەکیان ـ ئەگەر ببێ ـ ئەیخەنە ژێر پێی ئەو ژنانەوە ، کە کەس نازانێ چینو چۆنن ٠٠٠» ٠

ماموستای ناوبراو لە لاپەڕە (١٣٤)ی هەر ئەو جزمەدا ئەڵێ :

«ئەی گەنجەکانی سەدەی بیستەم توخوا حەیف نییە بۆ ئێوە لە جیاتی ئەوەی گرێی بەختی کچێکی دەست پاکی ڕوخسار پاکی خۆتان بکەنەوە ، ئەچن کچێکی بێگانە مارە ئەکەن کە جاسووسیتان بە سەرەوە بکەن ، وە منالەکانتان لێ داگیر بکەن ؟» ٠

## ئیسلامو فێربوونی زمانی بێگانە :

ئایینی پیرۆزی ئیسلام یاساغی نەکردووە فێربوونی هیچ زمانێك وەك زمانی (ئینگلیزیو ڕووسییو فەرەنسییو ئەڵەمانییو ئەمەریکی و ٠٠٠ ، چ جای ئەوە قورئانی پیرۆز بە هیماو لاتیر داوا ئەکات کە فێری هەموو زمانێك ببین ، چونکە لە جۆرەکانی زماندا دەسەلاتو گەورەیی خوامان بۆ ڕۆشن ئەبێتەوە ٠٠ وەك ئەم ئایەتەی بەردەستمان ئەفەرمووێ :

«ومن آياته خلق السموات والأرض واختلاف ألسنتكم وألوانكم ان في ذلك لايات للعالمين» الروم/٢٢ ٠

خۆ ئەگەر سەیری کردارو ووتەی پێغەمبەر ـ صلى‌الله عليه وسلم ـ بکەین ئەبینین هاوەڵەکانی ناردووە بۆ دەرەوەی وولات بۆ فێربوونی زمان ٠

زەیدی کوڕی ثابت ـ خوا لێی ڕازیی بێت ـ ئەفەرموێ : پێغەمبەر ـ صلى‌الله عليه وسلم ـ فەرمانی پیادام بۆ فێربوونی نووسینی «عیبریی» [واتە زمانی جوولەکە] وە فەرمووی : بەخوا جوولەکە هەرچی ئەنووسن ئەمین نیم ٠٠! زەید ئەفەرمووێ : نیو مانگی نەبرد بە تەواویی فێری زمانو شێوەی نووسینیان بووم ٠٠!! ئیتر لەمەودوا هەر من نامەم ئەنووسی بۆ پێغەمبەرو ئەی‌نارد بۆیان ، ئەوانیش بیبیان‌ناردایە من بۆم ئەخوێندەوە»(١) ٠

---

(١) تاج الاصول ، بەشی (کتاب الادب) ، بەرگی پنجەم ، ل٢٥٣ ٠

پێغەمبەر ـ صلى‌الله عليه وسلم ـ تا بەو جۆرە هەوڵی داوە بۆ تێگەیشتن لە مەبەستو کرداری بێگانە بە ئیسلام بە تایبەت «جوو»ی نەفامو بێ‌سۆز ٠٠! کە دوژمن‌ترین کۆمەڵی زەوین بەرامبەر بە موسلمانەکان ئەمەیشی بۆ ئەمە کردووە لە خوو نەریتیان بگات تا بتوانێ بەربەرەکانییان لەگەڵ بکات لە پاشەڕۆژدا ٠٠ یا ئەو ئایینەی هێناویەتی بۆیان ڕۆشنو ڕاڤە بکات ٠

بەڵام بە داخەوە دوژمنــانی ئیسلام ـ بە کۆنو تازەوە ـ لە هەوڵــدان بۆ دوور خستنەوەی ئیســلام لە کۆمەڵو کۆمەڵگا ٠٠ ئەم کارەیشیان هــەر جارەی بە شێوازێك بوو ٠٠٠ ئینجا موسلمانەکانیش واتە ئەوانەیان کە تەنها لە توێژی گەیشتبوون بە گوێیان کــردنو دەستیان لە هەموو بەرژەوەندییــەکی ئیسلام کێشایەوە ٠٠!! دوای ئەمە ڕێگە بـۆ دوژمن خۆش بوو درێغیان نەکرد لە پیلان نانەوەدا ، چونکە موسلمانەکان بێ‌ئاگا بوون لە زمانو کردارو ڕەفتاری ٠

ئەگینە موســلمانە تێگەیشتووەکان لە زۆربەی زانیارییەکانــدا مەلەوان بوون ٠٠ واتە زانیارییــان تەرخان نەکردبووە سەر هەندێ ڕێزمــانی عەرەبیی وەك : (نەحوو صەرفو بەلاغــەو مەنتیق ٠٠٠٠)و تەنها بەوانەوە خەریك بن ، ر (ریاضیاتو تەندروستییو ئەندازە ٠٠٠ هتد) بقــەبن !! نەخێر وانەبوون ، بەڵکو زۆربەیان لە زۆریاندا دەستی باڵایان بووە ٠٠٠ بۆ نموونە :ـ

١ ـ ئەبوو ڕیحانی بیــرونیی ٠٠ ئــەم زانایــە لە ساڵی ٣٦٢ی کــۆچیی هاتووەتە جیهانەوە ، تەمــەنی (٧٥) ساڵ بووە ، زانایەکی بەناوبانگ بــووە لە (ریاضیاتو گەردوونناسییو دەروونناسییو زمانی بێگانەدا) هەر وەك شۆرەتی بە زانایەکی مێژوویییو جوغرافیایی دەرچوو لە جیهانا ٠٠)(١) ٠

٢ ـ شەریفی ئیــدریسیی ٠٠ ئەم زانا پایەبەرزە لــە سەدەی یازدەهەمی زاینییدا هاتۆتە دنیاوە ٠٠ لە تاریفی ئەم زاتە دایە (جوتیە) کە ئەڵێت :

---

(١) المسلمون والعلم الحديث ، ل١١ ، عبدالرزاق نوفل ٠

«شەریفی ئیدریسیی ـ زانـای جوغرافیایی ـ مامۆستای هەمـوو ئەوروپا بوو لە جوغرافییادا ••» وە هەروەها ئیدریسیی لە جوغرافییادا کتێبێکی نووسی لە گرنگیی خۆیدا بەم چەندە زمانانە وەرگێررا :ـ

ا ـ ئەلەمانیی ••• ساڵی ١٨٢٢ •

ب ـ ئیتالیی ••• ساڵی ١٨٨٥ •

ج ـ ئیسپانیی ••• ساڵی ١٧٩٣ •

د ـ فەرەنسیی ••• ساڵی ١٨٣٩ •

## زاناکانی ئیسلامو بەشەکانی زانیاریی :

زانیاریی زانـا ئایینیەکان هەمـوو کات جێگەی ناز بووە بە تایبـەت لەم بەشانەدا :ـ

ا ـ کیمیـا •• لـەم بابەتـەدا کتێبـیـان ئێجـگار زۆر بووە ، بۆیـە لە کتێبخانەکانی (فەرەنسەو ئەلمانیاو ئیتالیا ••)دا پتر لە (٣٠٠) سێ سەد کتێبی موسلمانـەکان هەیـەو سـوودیان لێ وەرئەگیـرێ ، هـەروەك لە مۆزەخـانەی (بەریتانیا)دا زیاتـر لـە (٨٠) هەشـتا کتێب هەیـە ، وە زاناکانی ئینگلتـەرە کردوویانن بـە سەرچاوەی کیمیا • ئەمـەیش بەشێ لە زاناکانمان کـە پسپۆر بوون لە کیمیادا :

یەکەم : (جابیـری کوڕی حەیان) •• ئەم زانایە لە سـاڵی (١٠٠) سەدی کۆچیدا هاتۆتـە جیهانـەوە ، وە تەمـەنی (٩٣) ساڵ بووە • ئـەم بلیمەتـە بە «پێشەوای کیمیازانەکان دانراوە» •

دووەم : (جەعفـەری صادق) ـ کە لـە بنەماڵەی (حوسەینی کـوڕی عەلی ئەبوو تالیب)ە ـ وە مامۆستای جابیری کوڕی حەیان بووە ـ لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا کتێبێکی نووسی لە کیمیادا لە قەوارەی هەزار پەڕەدا •

سێهەم : (عیزەدین الجلدکی) •

چوارەم : (ئەبوول قاسمی ـ محمدی کوڕی ئەحمەدی عیراقی ٠ وە ٠٠٠٠ و ٠٠٠٠) ٠

٢ ـ پزیشکی ـ طبابة :ـ

ئەو زانایانەشمان دەستی بالآیان بووە لە پزیشکییەتدا ئەمانە بریتیانن :ـ

یەکەم : (رازی) ٠٠ ئەم زانا هەلکەوتووە ناوی (ئەبووبەکر محمد کوڕی زەکەریا)یە ، وە ئــەم موسلمانو خواناسو صــوفی تەبیعەتە لە نیــوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی زاینیدا لە نزیك شاری تەهرانەوە هاتووەتە جیهانەوە ٠

بەسە بۆ پایەبەرزییو نرخی ئەم پیاوە کە جوانترین زانکۆی ئەمەریکی ـ زانکۆی پرنستۆن ـ بە ناوی ئەوەوە ناونراوە ٠٠ وە تەنها لە (طب)دا (٢٢٩) کتێبی داناوە ، وە بە چەندەها زمان وەرگێڕاون ٠

ئەم خواناســە کاتێ کۆچی دوایی کرد بە هەژاریی سەری نایــەوە وە هیچ پارەو پوولێکی بەجێ نەهێشت ٠٠! چونکە بە خۆڕایی تیماری هەژارانی ئەکرد ٠٠ سەرەڕای ئەوەیش لە ماڵی خۆی دەرمانی بۆ ئەکرین ٠٠٠(١) ٠

برای بەڕێز :

سەرنجێکی ژیانی ئەم پیاوە هەڵکەوتووە بدە بزانە چی ئەبینی ٠٠٠؟ ئایا ئەم زانیارییەی کە بووی بەرگری کرد لە باوەڕهێنان بە بەرنامەی ئیسلام ٠٠٠ یا ووتی (زانیارییو ئاین دژیی یەکن ـ العلم الكافر ـ) ٠٠؟! یا ئیسلام کردی بە خزمەت گــوزاری هــەژارانو بــە ڕووی خــۆشو میهرەبانییــەوە پرســیاری لێکردن ٠٠؟ بەڵام داخەکەم هەندێ لە پزیشکە مێشك بەنجکراوەکانی ئێستامان لایان شوورەیییە خۆیــان بە موسڵمان بزانن ٠ نازانن ئەو زانیــارییەی ئەوان «هذه بضاعتنا ردت الینــا ٠٠»ە ٠٠ ئینجا چونــکە کافر پــەروەردەی کردوون هەمیشە خەریکی هەڵپەن بۆ پارە کۆکردنــەوە بێ ئەوەی گوێ بدەنە نەخۆشیی

---

(١) المسلمون والعلم الحديث ، عبدالرزاق نوفل ٠

هەژارە قوڕبەسەرەکان ... تەنانەت هـەر نەخۆشێك ئەو خۆی نەیخەواندبێت ئەوەندە لووتی پیا ناهێنێت ..! تا ناچاری ئەکات ئێوارە بڕواتە (عیادە)کەی .

بێجگە لەمەیش ئەگەر هەژارێك لە ماوەی مانگێکا هەشت ، نۆ جار بڕوات بۆ (عیادە)کەی هەروەك نەیناسیبێ‌و نەیدیبێ وایە .. واتە هەروەك یەکەم جار (پارەو پوول)ەکەی لێ‌ئەسـێنێ ..! خۆ زۆربەشیان لەوانن کە دڵیـان بووە بە (کەباب بۆ چینی پرۆلیتاریـا ..)! ئەگـەر ئەوانە ئەم مامۆسـتا موسڵمانەی خۆیانیان ــ رازی ــ بناسیایە ئاوا سەرگەردان نەئەبوون‌و سەریان نەئەکردە پارە کۆکردنەوەو لە مزگەوت نەئەسڵەمینەوە ..! .

دووەهەم : (ئیبن سینا)یە :

ئەبو عەلی حوسـەین کوڕی عەبدوڵـلای کوڕی سـینا بوو ــ ناوبانـگی بە (ڕەئیس) دەرکردبوو ، ئەم زانایە تەبیعەت صوفی بووە ، دڵی بەسراو بووە بە مزگەوتەوە ، بەتایبەت ئەگەر شتێکی لێ یاخی‌بوایە بە شەوو بە ڕۆژ لە مزگەوت دەرنەئەچوو .. دڵی جـووت ئەکرد لەگەڵ خوادا تا دەرگای گـرێ کوێرەکەی بۆ ئەکرایەوە ، ناوبراو پتر لە (١٠٠) سەد کتێبی نووسی لە پزیشکیدا .. ئەمانەی لای خۆیشمان قیبلەو ڕووگەیان ئەورووپایە بۆ چارەسەری گیروگرفتەکانیان ..!

سێهەم : (ئیبن روشد) :

ئەبول وەلید محمد کوڕی روشـد .. ئەم زانایـە سەر باڵـقەی هەموو پزیشکەکان بووەو ئـەم پیشەیەی کـردووە بـە حەوت بەشـەوە . وەك ئێستا دیراسە ئەکرێ .. لە یەکێ لە ووتەکانیـا هاتووە .. «ئەو کەسـەی خەریکی بەکاڵاکردنەوەی لاشەی مرۆڤ بێت بڕوای بتەوو بەهێز ئەبێت بە خوا ..» واتە ئەو دکتۆرانەی ئیشیان (عەمەلیات) کردنە ئەبێ زیاتر ئاقیدەیان ببێ بە خوای خۆیان ، چونکە چەندەها شتی سەرسووڕهێنەر ئەبینن ..!

ئاواتەخوازین خوای گـەورە ڕێنموونی پزیشـکەکانمان بکات بـۆ ڕێگەی بەختاریی‌و کامەرانیی ، ئەویش کە بڕوا بوونە بە بەرنامەی ئیسلام . بە کورتیی:

پزیشکایەتیی ـ کە ئێستــا بووە بە ماڵی بێــگانەکان ـ کاتی خــۆی لای موسڵمانە خواناسەکان زۆر باو بووە ٠٠ ئەوەتە لە سەردەمی (المقتدر باللە)دا ٠٠ بەغداد پتر لە (٨٦٠) پزیشکی پیاوی تیا بووە ، وە دوو ئافرەت کە پسپۆڕ بوون لە نەخۆشی ژنانەو منداڵ بووندا(١) ٠

٣ ـ زانیاریی سروشتناسیی :ـ

موسڵمانەکان چەندەها ئامێریان داهێنا بۆ دیاریکردنی کێشانەی کەرەسە جۆربەجۆرەکان ٠٠ بە شێوەیەك لەگەڵ زانیاریی تــازەدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە ٠٠ وە هەروەها لە (کێشندە ـ جاذبیە)دا تۆ ژینی زۆریان بڵاو کردەوە ، هەروەك لە «موگناتیس»دا دیراسەیانکرد ٠ وە هەروەها(٢) ٠٠٠٠ ئەمانە یەك ، دوانێکیانن :ـ

یەکەم : «ئەبینول هەیســەم» ٠٠ ئەم زانایە لــە ٣٥٤ی کۆچیــدا هاتۆتە جیهانەوە وە (٢٠٠) کتێبی دانــا ٠٠ (٤٧)یان لــە ریاضیاتو تەبیعــەتدا ، وە (٥٨)یان لە ئەندازەدا ٠

دووەم : «کەمالــەددین الفارسیی»(٢) زانــا موسڵمانەکان ئــا بەو جۆرە خەریك بوون بە زانیارییــەوە ، وە هەموو بەشەکانی زانیارییان بــە (ئیسلام) دائەنا ٠٠ وە ڕایان وابوو کە ئەم جیهانە پێویستیی بەوانە هەیە بۆیە پەلاماریان دایە ٠٠ چونکە ژیان هەر ئەبێ لە پاڵ ئیسلامدا بێت ٠٠ واتە ئیسلامو ژیان جیا نەکرێنەوە لــە یــەك لە ئاکامیشــدا ئیسلام لــە دەوڵــەت ٠٠! (وەکــو زۆربەی شاگردەکانی ئەوروپا) نیازیان وایە ٠

زاناکانمان ئا بەو جۆرە خەریك بوونو بەو جۆرە تێگەیشتن لە ئیسلام ،

---

(١) بــۆ ئــەوەی زیاتــر لــە بابــەکە تێبــگەیتو ددان بنێیت بــە زانیــاری موسڵمانەکاندا سەرێك لە (المسلمون والعلم الحدیث) بدە ، ل٨٧ـ٩٤ ٠

(٢) المسلمون والعلم الحدیث /عبدالرزاق نوفل ٠

خۆ ئاشکرایە ئیسلام بەو پێیە بڕوا زیان بەخش ئەبێت بە قوتابییەکانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاّت ۰۰! چونکە ناتوانن بیرو بڕوای ژەهراوییان بڕوێنن لە ناو کۆمەلّدا ۰۰ ئەویش کە بڕیتیبوو لە (جیاکردنەوەی ئاین لە ژیان ۰۰!) ئینجا هەر جۆرێکیان کردبێت بەلّکو بگەن بە ئاوات‌و نیازیاندا ۰۰ هەلّسان ئەم جۆرە زانیارییانەیان ـ ریاضیات‌و سروشت‌ناسیی‌و گەردوون‌ناسیی‌و ۰۰ هتد ـ دوور خستنەوە لە ئیسلام ۰۰ بەلّکو واشیان خستە پێش‌چاو کە (ئیسلام) ناگونجێ لەگەلّ ئەم جۆرە زانیارییانەدا ۰۰ واتە مامۆستای ئایینی هەر ئەبێ تۆزێ (ڕێزمانی عەرەبیی) بزانێت ، چونکە جۆرە زانیارییەکانی‌تر عەلاقەو پەیوەندییان بە (ئیسلام)ەوە نییە ۰۰!! خۆ ئەگەر زمانی ئینگلیزیی‌و فەرەنسیی‌و ڕووسیی بزانێت ئەوە ڕاستەو خۆ لە ئیسلام دوورەو بە پیاوی بێگانە تەماشا ئەکرێ ۰ ناحەز بە ئیسلام کۆلّنەدەر بووەو کۆلّنەدەریشە بۆ لێخن کردن‌و قەلاچۆکردنی ئیسلام ۰۰۰ بە چەندەها شێواز ۰۰ جارێ بە هێزی سەربازیی ۰۰ جارێ بەو ناوەوە زانیاریی دژیی ئایینە ۰۰ جارێ‌تر بە پیشەسازیی‌و تەکنەلۆژیا ۰۰ هەروەها بە زمانەوانیی ۰۰!

بۆ ئەمەیش مێژوو چاکترین شایەتە (هەرکات دوژمن دەستی کێشابێتە وولاتێکی ئیسلامییەوە بە گورجی هاشاوێی بۆ ڕووخاندنی زمانەکەی ـ قورئان ـ بردووە ۰

فەرەنسە کە لە سالّی (۱۸۳۰)ی زاینیدا (جەزائیر)ی داگیر کرد یەکەم پەلاماری ئەوەبوو زمانەکەی خۆی سەپاند بەسەریاندا واتە زۆری لێکردن کە بە زمانی فەرەنسەیی وتووێژ بکەن ۰۰ تا وردە وردە زمانەکەی خۆیانیان لە بیر بچێتەوە ۰ کە زمانی قورئان بوو ۰۰)(۱) ۰

یا ئینگلیز کاتێ (میسر)ی داگیرکرد لە (۱۸۸۲)دا ئەویش دەست بەجێ

---

(۱) التربية الاسلامية ، ژمارە (۹)ی سالّی ۱۹۷۷ ۰

پەلاماری بـۆ زمانەکەیان برد ۰۰!! ئەمەیشی زۆر بە وردیو لەسەرخۆ کـرد بۆ ئەوەی کەس هەستی پێنەکات کە بیرێکی ژەهراویی وای هەیە ۰۰! سەیری کرد هۆی مانەوەو تێکنەچوونی زمانەکەیان (ئەزهەر)ی پیرۆزە ۰۰ کەواتە باش وایە ئەزهەر قەلاچۆ بکات بەڵام نەك بەو شێوەیە پاچو خاکەناز بگرێ بە دەستەوەو لە بناغەوە بیهێنێ ۰۰ نەخێر ۰۰ ئەی چیبکات باشە بۆ سەرکەوتنی پیلانەکەیو کەسیش پێی نەزانێ ۰۰۰؟

هەڵسا بە کردنـەوەی چەندان قوتابخانە لـە دەوروبەری ئەزهـەرا لەسەر جوانترین هەندەزەو ئەنـدازە ، وە یاســاو بەرنامەیشی بـۆ دانان بـە ئارەزووی خۆی ۰۰ بێجگە لەوەیش بڕیاریدا هەرکەس بچێتە ئەو قوتابخانانەوە بە شەش ، حەوت ساڵ بڕوانامـەی بۆ بـکاتو لە دەزگاکانـدا دایمـەزرێنێ ۰۰ وە ئەوەی بڕواتە ئەزهەرەوە ئەبێ بیست ساڵ بمێنێتەوە ئەوجار بڕوانامەی بۆ ئەکات ، وە لە مووچەیشدا جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبوو ۰

ئەم خوا نەناسە بەم جۆرە ڕەغبەتی ئەزهەری کەمکردەوە لە دڵودەروونی خەڵکدا ۰۰ چونـکە ژیانو گـوزەرانی دنیـای لای ئەزهـەر کەم کـردەوە ۰۰۰ مەبەستیشی ئەوەبوو کـە قەڵەباڵغ لە دەوری ئیسلامدا نەمێنێو لـە پێشچاوی گەلدا لێخن ببێ ۰۰!!

ئینجـا (دنلوب)ی قەشـە دەستیکـرد بە دانـانی بەرنامەی خوێنـدن بۆ میسرییەکان بەم جۆرەی خوارەوە :ـ

یەکەم : ئاینو ڕێزمـانی عەرەبیی جیا کـردەوە لە ریاضـیاتو ئەندازەو تەندروستیی ۰۰۰ هتد ! ۰

دووەم : هەر مامۆستایەك کە زۆر پیرو پەككەوتوو بوایە ئەوە ئەکرا بە مامۆستای ئاین ۰

سێهەم : مووچەیەکی زۆر کەمی دیاریکرد بۆ مامۆستای وانە ئاینییەکان۰ ئەمەش وەنەبێ لە ڕووی بەزەییەوە بووبێت ، بەڵکو ڕامیاریی وای داواکرد ۰۰!!

چوارەم : لـە نەخشەی وانـەکاندا وانـە ئایینیەکان لـە دەرزی چوارەمو پێنجەمدا دانران ٠

ئەم چەپەڵە بۆیـە وای کرد تـا نە مامۆسـتای وانـە زەوقی بمێنێتو نە قوتابیش مێشکی تۆماری‌کات ، بەڵکو هەردووکیان ـ مامۆستاو قوتابی ـ لەبەر ئەوەی زۆر ماندوون دڵو چاویان ببرنە زەنگ لێدان ٠٠٠!!!

بەڵێ ٠٠٠ ئەم شەیتانە ئەم هەنگاوـە ژەهراوییەی داو لە دەمی بۆگەنیەوە چەندان قوتابی دڵسۆزی داناو ئیتر پاڵی لێداوە ٠٠٠٠!

دوژمنانی ئیسلام دەمێکە بیر ئەکەنەوە بۆ ئەوەی بزانن بە چ شێوەیە بێنە ناو خاکی ئیسلامەوە ٠٠٠! بۆ ئەم مەبەسـتە ژەهراوی‌یەیان چەندان کۆنگرەو کۆڕ بەسرا ، وە بـە سەدان تەگبیرو ڕاوێژ کرا ٠٠ هەر یەکەی بـە جۆرێ بەلام هیچی پەسەند نەکرا تا سەرەك وەزیران ووتی :

«قورئان لە ناویانا بمێنێتەوە ٠٠ واتە حوکمی پێ‌بکرێو بایەخی ببێ لە دڵیانا ـ ئێمە ناتوانین لە ووڵاتی ئیسلامدا بژین ٠٠!!» ٠

بـەڵێ ٠٠ وابـوو چونـکە تا قورئـان مامۆسـتای موسڵمانان بـوو ، وە سەرچاوەی یاساو ڕژێم بوو ، وە لە تاقەکانی مزگەوتا تەپوتۆز دای‌نەپۆشیبوو دوژمنان لە دوورەوە وەك سەگی دز بەلای چاوەوە هەر ئەیانڕوانی ٠٠ بەلام کە حوکمی قورئانی لە ولاتی ئیسلامدا هەڵگـرت ، وە بایەخی بۆ نەهێشتەوە لەناو گەلدا بەتایبەت لە قوتابخـانەکاندا ٠٠ ئینجا بێ‌تـرسو بیـم لە دەرگـاوە هاتە ژوورەوە ٠

دوژمن چی نەکرد بە ئیسلام ٠٠ ئایا وای پێ‌نەکرد کە زۆربەی خەڵك وا بزانێ بریتییە تەنها لە چەند وتارو کردارێکی ڕواڵەتیی ٠٠؟! چی پێ‌نەکرد ٠٠ ئایا وای نەکرد کە هەرکەس زۆر نەزانو نەشارەزابێت ئەو کەسە وانەی ئایین بڵێتەوە ٠٠؟!

ئایا وای نەکرد ڕێزی قورئان لە لای قوتابییەکانمان نەمێنێ ٠٠؟ ئایا وای

نەکرد کە پەرە قورئانەکان بە دەست شێلم فرۆشەکانەوە ببینرێ لە کۆلانەکاندا ۰۰؟!

ئایا وای نەکرد کە ئێمەیش لە نەخشەی وانەکاندا وانە ئایینیەکان لە وانەی چوارەمو پێنجەمدا دابنێین ۰۰؟ خۆ لای هەموو کەسیش ئاشکرایە ئەو ماوە چۆن ئەبرێتە سەر ۰۰ یا خەریکیان ئەکەن بە گۆرانی (هونەر !)و وەرزشو شتی واوە ۰۰ وەیا ئەر بەرەلاو ئەسوورێنەوە ، چونکە وانەی ئایینەو خۆیان ئەیزانن ۰۰؟!

وانەکانی‌تر هەربەکەیان مامۆستای پسپۆری هەیەو پشکێنەری هەیە ۰۰ کەچی وانەی ئاین هەرکەس ئەیلێتەوە بیلێتەوە ۰۰!!

موسلمانەکان تا وریاو مەرد بوون ، وەتا ئاگایان لە ئیسلام بوو تەنها ئەوان بوون سەرچاوەی زانیاریو پیشەسازیی بۆیە بێگانەکان پۆل پۆل ئەهاتن بۆ ناویان بۆ فێربوونی زانیاریو تەکنەلۆژیا !

جارێکیان پاشای ئینگلتەرە (بەنگالو سویدو نەرویج) کۆمەڵێکی ناردە (ئەندەلووس)ەوە لەگەڵ نووسراوێکدا بۆ خەلیفەی موسلمانەکان ، ئەمەیش دەقی نووسراوەکەیە :ـ

لە پاشای ئینگلتەرەو گالو سویدو نەرویجەوە (جۆرجی دووەم) بۆ لای خەلیفەی موسلمانان لە ئەندەلووسدا خاوەن شکۆ هیشامی سێهەم ۰

دوای پێشکەشکردنی سوپاسو رێز بە بارەگاتان ۰

بۆمان دەرکەوتووە کە ئەو هەموو پیشەسازییو زانیارییە ولاتەکەتانی رازاندووەتەوە ، وە لە ژێر سێبەری زانیارییدا ئەژین ، لەبەر ئەوەی کە تیشکێ لەو بەهرەیەمان بەرکەوێ ۰۰ ئەوا هەندێ لە لاوەکانمان ئەنێرینە خزمەتتان ۰۰ وە خاتوو (دوپانت) سەرپەرشتی‌کەری کۆمەڵی ئافرەتان بێت ، هەرچەند ــ ئەو ئافرەتانە دێنە لاتان لە بنەماڵەیەکی بەشەرەفی ئینگلیزن ۰

کارگوزارو فەرمانڕەواتان
جۆرج ۰ م۰ ۱ (۱)

---

(۱) گۆڤاری (التربیة الاسلامیة)ی بەغداد ، ژمارە (۹۲)ی ساڵی ۱۹۷۷ ۰

دوژمن ئا بەو جۆرە لە هەوڵو تەقالادایە بە شەوو بە ڕۆژ بۆ پێشخستنی وولاتەکەی ، بـەڵام ئەگەر ئێمـە ڕۆژێ چاو بـکەینەوەو بمانـەوێ ئاڵوگۆڕی زانیاریی‌و پیشەسـازیی بکەین ٠٠ یا هـەر هیچ نەبێت فێری زمانـەکەیان ببین لەولاوە کۆمەڵێکی موسـڵمانی وشکمان لێ‌هەڵئـەپەڕێت‌و ئەڵێت : بـە ڕێگەی خۆتانەوە بڕۆن هەقتان چی‌یە بەسەر زمانی ئینگلیزی‌یەوە ٠٠ موسڵمان لە کوێ‌و ئینگلیزیی ئەکوێ ٠٠٠!!

لەوانەشە هەندێ کەس باوەڕ بکات کـە ئیسلام ئەوەندە ووشك بێت ٠٠ نەخێر هەرگیزای هەرگیز وا نییە ٠٠ چونـکە ئەوەتە ڕابەرە خۆشەویستەکەمان موحەممەد ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ فەرموویەتی :

«هەرکەسێ زمـانی هەر کۆمەڵێـك بزانێت لە پیلانو فڕوفێڵیـان ڕزگار ئەبێ» ٠

به کورتیی :

ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەرگای لەسەر پشت وازکردووە بۆ هەر زانایەك کە بە ئارەزووی خۆی لەم بوونەوەرە بکۆڵێتەوەو شت دابهێنێ ٠٠ نەك وەك کەنشتە کە بڕیاری بێ ئایینی دەرکرد بەوانەی سەرپێچی بڕیارەکانی ئەوی کرد ، وە بە سەدان زانـای کـوشت‌و سووتانـدی پەرتـووکەکانیشی قەدەغـە کردن لـە ناو کۆمەڵدا ٠٠!!

## پێنجەم : سەربەستیی لە ئیش کردندا :

مرۆڤ لە ئیسلامدا چ ئیشێ هەڵبەبژێرێ ئازادە ، واتە خۆی هێزی بە مل کام ئیشدا ئەشکێ بەرگری ناکرێ .. بەو مەرجە لە چوار چێوەی ئیسلام دەرنەچێت .

جا وەك سەربەستە لە ئیش کردندا ، هەروایش ئازادە دەست لە کارکردن هەڵگرێ ، ئەمیش بەو مەرجەیە زیان تووشی کۆمەڵ نەبێت بۆیە زانا یاساناسەکان وتوویانە ئەگەر کرێکار دەستی لە ئیش هەڵگرت وە لەمەدا بەرژەوەندیی گشتیی پەکی کەوت ، ئەوە بۆ کاربەدەست (ولی الامر) رەوایە زۆر بکات لەوانە کە ئیش ناکەن .. تا کۆمەڵ تووشی زیان نەبێ بە هۆی ئیش نەکردنی ئەوانەوە ...!

کەواتە مانگرتن لەکار (الاضراب عن العمل) لە یاسای ئیسلامدا شتێکی نارەوایە(۱) ، چونکە زیان ئەگەیەنێ بە هەموو هاو وولاتییان بە منداڵو پیرو گەنجو پیاوو ئافرەتەوە ، خۆ ئەگەر بۆ ئەمەیش بێ کە خاوەنکار تەمێ خوار ببێتو ئاووڕێك بداتەوە بەلایاندا .. دیسانەوە هەر رەوا نییە ، چونکە ئیسلام لە دەرەوەی ئیشەکەوە وەصیەتی کردووە کە خاوەنکار ئەبێ خاوەن سۆزو بەداد

---

(۱) چونکە یەکەم : لە کۆمەڵی موسڵماندا کەس مافخوراو نییە ، چونکە یاسای هەرەمەکیی حوکمی کۆمەڵ ناکات ، تا خۆیان بیر لە بەرژەوەندیی خۆیان بکەنەوەو مافە ژێرپێخراوەکان داوا بکەن ... بەڵکو یاسای ئیسلام دەست رۆیشتووەو هەرچی بەرژەوەندیی خۆییو گشتیی هەیە بەرچاو خراوەو ئامادەکراوە .. (بەڵام بە مەرجێ فیقهی ئیسلامیی چالاکی خۆی ببینێو کۆمەڵەکە موسڵمانی راستەقینەبێ) .

دووەم : لە ئیسلامدا جەنگی چینایەتییو بەگژا چوون نییە ، بەڵکو هەموو موسڵمانێ ئەرکی سەرشانی خۆی پێویستە بزانێو پێی هەڵسێ ئەوسا مافی هەیەو کەسیش بۆی نییە لێی زەوت بکا .

بێت بەرامبـەر بە کرێکار ، هەروەك کرێکارەکەی تێگەیاندووە کـە گزێکاریی و خەیانەت نەکات لە ئیشەکەیدا ٠٠» ٠

وتمان مرۆڤ لە ئیسلامدا چ ئیشێ هەڵبژێرێ ئازادە ٠٠ بەڵێ ئەمە وایە سا مەگەر کاتێکی تایبـەتی ڕوو بدات ـ ظروف استثنائية ـ ئەوە لـەو کاتانەدا سەرەك دەوڵـەت ئیشـەکەی بـۆ ئەگـۆڕێ و ئەیخاتـە سەر ئـەو کارەی کۆمەڵ پێویستیی پێی هەیە ٠٠ ئەمیش نابێ سەربەخۆ بیکاو گوێ بە هیچ نەدرێ ٠٠٠!

بەڵکو ئەبێ پرس و ڕا بە ئەنجوومەنی ڕاوێژکاریی (المجلس الاستشاری) بکات تا بە وردیی لـە مەسـەلەکە بکۆڵێـەوە : ئاخـۆ ئالووگۆڕکردنی ئـەم کرێـکارە بەرژەوەندیی گشتیی تێدایە ٠٠٠ یا نە ٠ بۆ نموونە :

کرێکارێك لە دەزگای کشتوکاڵ ئیش‌کات ، بە زۆربە وایە کرێکاری ئەو دەزگایە بە زسـتاندا ئیشیان نییە ٠٠ وەیا ئیشیان کەمە ، بەڵام لـە دەزگای پیشەسازییدا کرێکارێك کەمە ٠٠٠ ئەوە لەم کاتەدا ئەو کرێکارە لە کشتوکاڵ ئەگوێزرێتەوە بـۆ دەزگای پیشەسازیی بـۆ ئەوە بەرووبوومو بەرهـەم کەم نەکات ، وە لە ئاکامدا هاو وولاتییان نەبوونیی و گرانیی ڕوویان تێ‌بکات ٠

ئەمە لـەم ڕووەوە ٠٠ ئینجـا لـە ڕووی پێویسـتییەکانی کرێـکارو هاو وولاتییانەوە پێویستە لەسەر دەوڵەت چییان پێویستە بۆیان جێبەجێ بکات ٠٠ لە ئامێرو جێگەی حەوانـەوەو پشوودان ٠٠ خـۆ ئەگەر دەوڵـەت پشت گوێی خست ٠٠ ئەوە کرێکار بۆی هەیە یەقەی سەرەك دەوڵەت بگرێ ٠

لێرەدا کە باسی ئـازادیی کرێکار ئەکەین لـە هەڵبژاردنی کـاردا جێگەی خۆیەتی سەرنجێـکی یاسـای ئابـووریی سەرمایـەداریی بدەیـن بـۆ ئـەوەی بەراوردێکی سـەرپێییان بکەین لەگەڵ ئیسلامدا ٠ زانایانی یاسـای ئابووریی سەرمایەداریی ئەڵێن : «بۆ ئەوەی ئەم یاسایە جێگیر ببێ و بچەسپێت لە وولاتا پێویستە بناغەکەی لەسەر ئەم خاڵانەی خوارەوە دابنرێت :

١ ـ بەرژەوەندی خۆیی (المصلحة الشخصية) :

واتە ئەبێ ئەو کرێکارە داخوازێکی تایبـەتیی خۆیی ببێ بۆ ئەنجامهێنانی ئەو کارە ٠

٢ ـ سەربەستی لە ئیشدا :

چونکە ئازادیی لە ئیشدا پێشبرکێ دروست ئەکات لەناو کرێکاراندا ٠٠ ئەمەیش ئەبێتە هـۆی چوستییو چالاکیی مرۆڤ ٠ واتە نابێ لە هیـچ کاتێکدا دەست بدرێتە بەردەستییو لەسەر ئیشێك بگوێزرێتەوە بۆ سەر کارێکیتر ٠٠!!

هیچ گومانی تێدا نییە سەربەستیی ئا بەو شێوەیە ئەبێتە هۆی دروست بوونی چەندەها گیروگرفت لـە ژیاندا ، چونکە کرێکار ئەوەندە ئـازاد بێتو ڕۆژێ لە ڕۆژان کەسنەوێرێ بلێ : وەرە لەکارگەی شەکرەکە ئیشبکە ، چونکە بەرهەمی شەکر لە بازاڕدا کەمە ، واتـە لە کارگەی خۆتـا ئیش مەکە لێـرە ئیش بـکە تا ئەندازەیەك شەکر بکەوێتەوە بازاڕەوە ٠٠

هەندێك لەو گیروگرفتانە ئەمانەن :ـ

١ ـ داخستنی کارگەکانوماتڵ بوونی کرێکار ، چونکە کە ئامێر لە جێگەی دەستا ئیش بکات بە ڕۆژێ پێویستیی چەند ڕۆژێکی جێبەجێ ئەکات ٠٠ دە ئیتر ڕۆژەکانی تر ئەبێ ئەو کرێکارە بێئیش دانیشێ ٠

٢ ـ ئەم کردەوە ئەبێتە هۆی ئەوە بێکارە زۆر ببێ لە وولاتدا ٠

٣ ـ لە بێکارەییەوە خۆ دەرخستنو ئاژاوەو هێرش بردنە سەر خاوەن کارگەکان پەیدا ئەبێ ٠

٤ ـ سـەرئەنجام دوژمنایـەتییو ناکـۆکیی دروست ئـەبێ لـە نێـوان دەوڵەمەندو هـەژاردا ٠ واتە ناچـار چینی هەژار یەك ئەگرێ بۆ لەنـاو بردنی دەوڵەمەندەکان ٠٠ ئیتر بێجگە لە بێمتمانەییو دزییو گزییو خەیانەت کردن لە یەکتر ٠

رژێمی سەرمایەداریی خاوەنی ئەم هەڵانەیەو بێجگە لەمانەیشە بۆیە هێرشی پەلاماری بۆ هێنراو ئەم رەخنانەیان لێ گرت :

- بەرژەوەندیی خۆیی لە ئابوورییدا ئەبێتە هۆی کۆبوونەوەی دارایی و سامان لای هەندێ .. واتە سەرمایەدار دروست ئەبێ .

- ژێر دەست بوونی مرۆڤ و هەڵسووڕاندنی بە ئارەزوو و ئاواتی سەرمایەدارەکان .

- داکەوتنی هەژاریی و نەبوونیی و بڵاو بوونەوەی ستەم لە نێوان چینەکاندا .

نهێنی نییە لای هیچ کەس کە سەربەستیی ئابووریی سەرمایەداریی بەو شێوەیە بێجگە لە ئاژاوە (فوضى) هیچی تر وەدەست ناخات ، چونکە رژێمێك تاك سەربەست بکات چی بەرهەم بێنێ نابێ کەس بەرگری بکات ..!! گومانی تێدا نییە ئەنجامی ئەمە قاتوقریی دروست ئەکات لە وولاتدا .

جا چونکە رژێمێکی ئاشراوو دەستهەڵبەسراوەو بەئارەزووکاریی داڕێژراوە ئاشکرایە لەگەڵ ژیانی هەموو ئادەمیزادێکا ناگونجێ .. بۆیە بەرشەق دراو لە وولاتا کرایە دەرەوەو کەوتنە پینەوپەڕۆ کردن بەڵام بە شێوەیەکی تر ..! هەرچەندە ئەمیش کۆمەڵ رائەکات لە دەمتیی و ئێقی لێ ئەکاتەوە .

ئەوانەی ئەیانەوێ ئەو - سەرمایەداریی - ە نەمێنێ و رژێمێکی تازەی ئەوان بسەپێنرێ بەسەر کۆمەڵدا رایان وایە بەم جۆرە بێت :-

١ - قەلاچۆکردنی خاوەنێتیی خۆیی (محو الملكية الفردية) بەو مانایە نابێ هیچ کەسێك خاوەنی هیچ جۆرە شتێك بێ بێجگە لە دەوڵەت ئینجا خاوەنە پێشووەکەی ئەکرێ بە کرێکار لە کۆمپانیاو کشتوکاڵ و دەزگا پیشەسازییەکانی تردا .. وە دەوڵەت بە ئارەزووی خۆی ئەمدیوو و ئەودیوی پێ ئەکات بەرامبەر بەو کرێیە

بۆی براوەتەوە ‥ ئیتر بێجیاوازیی لە نێوان کرێکارەکانـدا • واتە چەندە زەبوونو لاوازبێ لە کاردا ، وەیا چەندە بەهێزو بە باهوو بێت وەك یەك کرێ وەرئەگرن ‥!!

٢ ـ دابەشکردنی شتوومەکی تێچوون (استهلاك)ی بەسەر تاکدا هەر یەکە بە گوێرەی بەرهەمو پێویستیی ‥ بەو مانایە نابێ تاك هیچ پاشەکەوتێکی ببێ ‥

٣ ـ دانانی بەرنامەیەك بۆ بەرهەم هێنان بە گوێرەی پێویستی کۆمەڵ سەبارەت بەو بەرووبوومە •

ئەم یاسایە هەرچەندە لافی یەکسانیی لێئەدات لەناو چینەکاندا واتە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد هەموو وەك یەك بژین بێ قاتو قڕیو دوژمنایەتییو ناکۆکیی لە ناویاندا ‥!!

ئەم یاسایە هەرچەند ئەو لافە لێئەدات بەڵام ئەم رەخنانەی لێگیراوە :ـ

یەکەم : مراندنو پساندنی ئەو هێزو باهوو دەسەڵاتەی لە مرۆڤدا هەیە ، چونکە لە کاتێکدا ئیشکەرو ئیشنەکەر ، وەیا چاکو خراپ وەك یەك تەماشا بکرێو رۆژانەی بەش دابنرێ ئیتر ئەو کەسەی کە زۆر بە باهووە هیچ خۆی ماندوو ناکات ، وە بەرهەمی ئەوتۆ بە دەست ناهێنێ بۆ وولاتو نیشتمان !! •

دووەم : ئەو هێزەی لە مرۆڤدایە رۆژ بە رۆژ لە گەشەدایە ، بەڵام بەم یاسایە پێچەوانە ئەبێتەوە •

سێیەم : ئەو کۆمەڵەی لە ژێر ئەم یاسایەدا بژین وەك ئامێرێکی بێهەستو نەستیان لێدێت ‥ ئیتر هیچ هێزێکی دەروونیی نامێنێ پاڵی پێوە بنێت بەرەو رەورەوەی ژیان ‥ چونکە خۆی بېرێو خۆی بکوژێ هەر ئەو ئەندازەیە وەرئەگرێ کە دەوڵەت بۆی بریوەتەوە بە کورتیی :ـ

سەرمایەداریی بناغەو یاسای لەسەر ئەوەیە کە : تاك ـ فرد ـ زۆر بەرێزو بەنرخە ، وە نابێ کەس دەست بداتە بەردەستی ، هەر وەك یاساغە بۆ

کۆمەڵ ئــازادیی‌و سەربەســیی لێ زەوت بــکات ، واتــە ئەم یاسایــە تەماشای بەرژەوەندیی گشــتیی ناکات ، بەڵکو تەنها سوودی خۆیی لا مەبەســتە ٠٠ بۆیە موڵکایەتیی تــاکیی بــەلاوە پەسەنــدە ٠٠٠ ئیتــر بێ ســنوور دانــان بــۆ ئەم سەربەستی‌یە ٠

واتە هەر تاك پووڵ‌و پارەی دەستکەوێ ئیتر بەر پرسیار نی‌یە لە پەیدا کردنەکەیدا !! ئەمە یاسای سەرمایەداریی بەم جۆرە ٠

ئینجا یاسای ئابووریی (کۆمۆنیستیش) بەو ڕچەدا ئەڕوات کە بێجگە لە گەڵ کــەس مەبەست نی‌یە ٠٠!! واتە تاك لەم ڕووەوە کە تاکەو بۆ خــۆی ئەژی هیچ کێشێکی لا نی‌یە بۆیــە بەلایانەوە هەموو شــتێك هی دەوڵەتەو تــاکی تیا بێبەش ئەکەن بەو شێوەیە نەبێ کە وتمان ٠

ئەمە یاسای ئابووریی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات بوو لە بارەی ژیانەوە کە ئەو هەموو عەیب‌و نەنگەیان هاتووەتە سەر ٠٠ لەلایەن زانایان‌و ڕۆشنبیرانەوە ٠٠ دە ئایا ئیتر هەقی شوێنکەوتنی هەیە یاسای ئاوا ٠٠؟

ئینجا ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە ڕوانگەیەکی ترەوە سەیری مرۆڤ ئەکات‌و ئەڵێت : تاك دوو مافی هەیە لەیەك کاتا :ـ

لەم ڕووەوە کە تاکەو بۆخۆی ئەژی ٠

لەم بارەیشەوە کە ئەندامێکە لە کۆمەڵ‌و لەگەڵ ئەواندا ئەژی ٠٠

لە هەردوو ڕووەکــەوە زۆر بــە چاوی ڕێــزەوە تەماشای ئــەکات ، وە بە خاوەنی شتی دائەنێت ٠ واتە نەوەك ســەرمایەداریی پیایا ئەڕوانێت وە نەوەك شیوعی‌یەت ٠ بەڵکو بۆ هەر یەکەیان بەرنامــەی تایبەتیی داناوە بۆ ئەوەی ژیان لارەسەنگ نەبێت ، وە لــە ئاکامیشدا دەستیان ئەکاتەوە مل یەکتــرو وەلامی داخوازی‌یەکانیان ئەداتەوە ٠

بەمەدا دەرئەکەوێ کە ئیسلام خـاوەنی یاسای ئابووریی تایبەتیی خۆیەتی نە لە یاسای ئابووریی ڕۆژئاواو نە لە یاسای ئابووریی ڕۆژهەلات ئەچێت ... وە هەروەها دوورە لـەو کـەمو کوڕیانەی کـە هەردووکیـان تا بینەقاقـە تیایا چەقیون . ئەوەتا ڕێگای مولدایەتیی داوە ـ دیارە حۆشەویستیی مولکایەتیی لە دلی ئادەمیزادا ڕیشەی داکوتاوە ـ بەلام بە شێوەیەك نەخشەی بۆ کێشاوە زیان نە بە خۆیو نە بە کۆمەل نەگەیەنێ .

وە ڕێگەشی هێشووەتەوە بۆ کۆمەل ، یا بۆ نوێنەری کۆمەل کە هەر کات بەرژەوەندیی گشتیی تێدابوو دەست کاری مولکایەتیی تاکیی بکەن ...(١) .

کەوابـوو یاسـای ئابـووریی ئیسـلامیی لەگـەل یاسـای ڕۆژهـەلاتو ڕۆژئاوادا ناگونجێت .. ئەوەتا بە ئایەتی :

«ما أفاء الله على رسوله من أهل القرى فلله وللرسول ... كي لا يكون دولة بين الأغنياء منكم ..» .

سەرمایەداریی ئەڕواتە دەرەوە .

هەروەك بە ئایەتی :

«نحن قسـمنا بينهم معيشتهم في الحياة الدنيا ، ورفعنا بعضـهم فوق بعض درجات ليتخذ بعضهم بعضا سخريا ..» .

شیوعیەت تار ئەنرێت .

دەبا بۆ هەمـوو کـەس ئاشکرا بێ ئـەوەی بـاری ژیانی لـەو یاسایانەوە وەرگرێ ـ بێجگە لە ئیسلام ـ ئەوە ئەبێ بە ئەندامێکی ئەو یاسایەو لە ڕچەی ئیسلام دەرئەچێت .

ئاخ ! ئەمزانیی ئەوانـەی داوای ئەمانی خاوەنێتی تاکیی ئـەکەن ڕازی

---

(١) شبهات حول الاسلام .

نەبن کـە بـاری ژیانیـان وەك یـەك بێت ‎٠٠‎؟ واتە مووچـەی ئەندازیـارێكو کرێکارێك ، وەیا ئەفسەرێكو سەربازێك ‎٠٠٠‎ وەك یەكبن ؟!

وەیا لەو شوێنانـەدا هەوڵدراوە بـۆ لابردنی موڵکایەتیی تـاکیی تەتبیق کراوە ‎٠٠٠‎ ؟

بەڕێز دکتۆر (مصطفى السباعي) لـە سەردانەکەیدا بۆ شۆرەوی ئەڵێت :

«یەکیەتی سۆڤییەت کە دەوڵەمەندترینی وولاتە سۆشیالیستەکانەو ، هەوڵ ئەدات بۆ تەتبیقی سـۆشیالیستی ، بە چـاوی خۆم بینیم کە خەڵـکەکە دۆخو بارێـکی جیـاوازیی هەبـوو لـە ژیانـدا ، وە لە رابـواردندا ‎٠٠‎ کرێـکار بوو دەستکەوتی مانگانەی (‎٥٠٠‎) ڕۆبڵ بوو کەچی سەرۆکی دانشگا (‎١٥٠٠٠‎) هەزار ڕۆبڵ بوو ‎٠٠٠‎!!» ‎٠‎

هاو وولاتیی وابوو لە ژوورێکی سـادەی بچووکدا دائەنیشت ‎٠٠‎ کەچی مووچەخۆرێـکی گەورە ، یـا وەزیرێـك ، یـا حیزبیەکی گـەورەو دیـاریی لە کۆشکێکی نایابدا دائەنیشت ، وە لە تازەترین مۆدێل ئۆتۆمۆبیلیشی بوو ‎٠٠‎! نە تەنها ئەمە بەڵکو «سواڵکەر»م ئەدی لە دەرگای مزگەوتێکدا دەستی ڕائەکێشا بۆ خێرو خێرات ‎٠٠‎ خەڵـکیش پارەتیـان ئـەدا ‎٠٠٠‎! ئینجـا منیش دەست بـەجێ هەڵسام وێنەی ئەم سواڵکەرەو دەست پانکردنـەوەکەیم گرتو ئێستاش لای خۆم ماوەتەوە ‎٠‎ کەواتە نـە شیوعییەتو نە دەوڵەتە گەورەکەی نـاتوانن هەژاریی‌و نەبوونیی لەناو ببەن ‎٠٠٠‎ بە مانا جیاوازیی نەمێنێ لەناو خەڵکیدا وەك ئەوان داوای ئەکەنو مێشكو گوێی خەڵکییان پڕکردووە(‎١‎) ‎٠‎

---

(‎١‎) اشتراكية الاسلام ، ل‎٨‎ـ‎٩‎ ، دكتۆر مصطفى السباعي ‎٠‎

# نرخ‌و ڕێزی كارو كرێكار له‌ ئیسلامدا

ئیشكه‌ر لای خوا زۆر به‌ڕێزو خاوه‌ن پایه‌یه‌ ، چونكه‌ به‌ ئیش كردن خاكی ئیسلام ئه‌پارێزرێت له‌ هاشاوتی كافران ، وه‌ به‌ به‌ده‌ست هێنانی به‌رو بووم ئه‌توانرێت پێویستی‌یه‌كانی جه‌نگاندن‌و به‌رنگار بوون له‌گه‌ڵ دوژمنانی ئیسلامدا به‌رامبه‌ریی بكرێ •

پێغه‌مبه‌ران ـ علیهم الصلاة والسلام ـ چونكه‌ به‌ ره‌نجه‌شانی خۆیان ژیاون چه‌نده‌ كارو كرێكاریان به‌لاوه‌ خاوه‌ن رێزه‌ !! پێغه‌مبه‌رمان محمد ـ صلى الله عليه وسلم ـ جارێك رێگه‌ی كه‌وته‌ لای كرێكارێك‌و ویستی ته‌وقه‌ له‌گه‌ل كرێكاره‌كه‌دا بكات ! به‌لام كرێكاره‌كه‌ شه‌رمی كرد ده‌ست بدات به‌ ده‌ستی‌یه‌وه‌ ، ئینجا پێغه‌مبه‌ر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ده‌ستی گرت‌و ماچی كردوو فه‌رمووی : «خه‌لكینه‌ بزانن ئه‌م جۆره‌ ده‌ستانه‌ خواو پێغه‌مبه‌ری خوا خۆشیان ئه‌وێن»(٢) • چونكه‌ له‌ هه‌وڵدایه‌ بۆ په‌یداكردنی نان‌و خۆراك بۆ ماڵ‌و منالیان‌و ناهێلن كۆرپه‌كانیان برسییان ببێت بۆ ئه‌وه‌ی فێری ده‌ست پان‌كردنه‌وه‌ نه‌بن له‌ ناو كۆمه‌لدا ، چونكه‌ ده‌ست پان‌كردنه‌وه‌و سوال كردن ده‌ردێكی كوشنده‌ی كۆمه‌له‌ وه‌ هه‌ر كۆمه‌لێك ، وه‌ یا هه‌ر خێزانێك ده‌ست پان‌كردنه‌وه‌ی تێكه‌وێ به‌ره‌و ڕیسوایی‌و ڕووخاندن مل ئه‌نێت •

له‌به‌ر ئه‌مه‌ بوو پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستمان زۆر هه‌وڵی‌دا بۆ ریشه‌كه‌ن كردنی به‌ چه‌نده‌ها شێوه‌و شێواز •

كابرایه‌ك هاته‌ لای داوای شتی لێ‌كرد ـ به‌ شێوه‌ی سوال ـ پێغه‌مبه‌ر ـ صلى الله عليه وسلم ـ فه‌رمووی :

---

(٢) العمل والضمان الاجتماعى فى الاسلام ، دكتۆر صادق مهدى السعيدى •

ئەرێ ئەوە فلانەکەس لەماڵەوە هیچ شتێك شك نابەیت (وا سواڵ ئەکەی؟)
وتی : نەخێر بێجگە لە جامێکی ئاو خواردنەوەو پارچە بەڕەیەك نەبێ ٠٠!!
ئینجا فەرمووی : هەر ئێستا برۆ بۆم بهێنە ، ئەویش بە گورجی ڕۆیشتو
بۆی هێنا ٠٠٠ پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - فرۆشتی بە درهەمێکو دایەوە
بە کابراکەو فەرمووی : نیوەی بدە بە گوریسێکو تەورێك برۆ دارفرۆشی بکەو
تا دە ڕۆژی تریش نەتبینمەوە ٠٠ دوای دە ڕۆژەکە هاتەوە ٠٠٠ پێغەمبەر
فەرمووی : ئێستا ژیانت چۆنە ٠٠؟ وتی : ئەم ماوەیە بە ڕێکوپێکی خێزانەکەم
ژیاوە ٠٠، وە ئێستایش (١٠) دە درهەم پاشەکەوتمان هەیە ٠

پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - فەرمووی : دە برۆ بە ڕەنجە شانی خۆت
بژی نەك بە سواڵکردن ، چونکە سواڵکردن - لەبەر بێڕێزیی سواڵ -
خاوەنەکەی لە ڕۆژی دواییدا مەقاش بگرە لە دەموچاوی گۆشتی پێوە نایێت ،
سواڵ ئەبێتە هۆی پەیدابوونی خاڵێکی ڕەش لە دەموچاودا ٠٠٠! ٠

یان ئەفەرموێ : «هەرکەس ئێوارە بکاتەوە بە ماندوویی لەبەر ئیشکردن
(بۆ پەیداکردنی نانو خۆراکی حەڵاڵ) ئەوە ئەو کەسە خوا لە تاوانەکانی خۆش
ئەبێت ٠٠» ٠

## تەمەڵیو ئیش نەکردن

پێغەمبەری ئازیز - صلی الله علیه وسلم - ئەفەرموێ :-
«خراپترین نەتەوەی من کەسانێکن لەناو ڕۆزییدا پەروەردە بکرێن٠٠»(١)
واتە لە بنەماڵەیەکی بەدەسەڵاتو خۆسەپێنەر بەسەر کۆمەڵدا ، بێهەست
کردن بە چاکەو خراپەو تەنها ئاواتیان ڕابواردنە ٠٠!!

---

(١) الاسلام والمناهج الاشتراكية ، ل٢٠٨ ، محمد الغزالي ٠

خوێنەری بەڕێزم :

ئیش‌و کـردو کاسبی — هەرجـۆرێ بێت — لە ئیسلامدا بەنرخـە ، بەو مانایە ئەوەی ژیانی مرۆڤی لەسەر ئەڕوا خاوەن ڕێزو پلەیە ... لە گسکدانی شەقامەکانەوە تا کورسی‌ی سەردك دەوڵەتی .

ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر بەرقە بەرامبەر بە تەمەڵ‌و ئیش‌نەکەر .. باسی پیاوێك‌کرا لـەلای پێغەمبەردا — صلى‌الله عليه وسلم — گوایـا زۆر خەریکی خوا پەرستییەو دەستی لە دنیـا شۆریوە .. واتـە خەریکی هیچ جـۆرە کارو فەرمانێك نابێت نوێژو زیکرو هەندێ ئەوراد نەبێت .. پێغەمبەر — صلى‌الله عليه وسلم — بەسەر سوڕمانێکەوە فەرمووی :

ئەی ژیانی لەسـەر کێـیە ؟! ووتیـان لەسـەر براکەیـەتی .. پێغەمبەر — صلى‌الله عليه وسلم — فەرمووی : «بزانن براکەی لە خۆی خواناس‌ترە» .

چونکە براکەی نوێـژو پێویستی‌یەکانی‌تری ئایین بـەجێ دێنی‌و ڕۆژییش پەیدا ئەکات بۆ خاوخێزانی .. لەولایشەوە خۆی نەکردووە بە (دابەستە)ی ناو کۆمەڵ‌و هـەر پارووێـەك خـۆش بێت ئـەو بیخـوات ، چونکە خـۆی بـۆ خوا ..ووتانەوە ..!!

بەڵێ ... بەنـدەی خواناسی ڕاستەقینە هیچ‌کات خۆی نەکـردووە بە بار بەسەر موسڵمانانەوە ، وە دەست لە هەموو ئیشـێك هەڵگرێ‌و گیرفان بدڕێتەوەو چاو ببڕێتە ڕەش‌و ڕووت‌و هەژارو داماو بەو ناوەوە بە کەڵکی دوا ڕۆژ دێت ..!

نەخێر موسڵمانی تەواو ئەو کەسەیە قۆڵ هەڵماڵێ‌و ئیش بکات‌و خاوخێزانی لە نەبوونی‌و دەست کورتیی ڕزگار بـکات .. درێغیش نەکات بـۆ بڵاوکردنەوەی ئایین‌و پەروەردەی مـەردم بە قورئان‌و فەرموودەو کرداری پێغەمبـەر — صلى‌الله عليه وسلم — . پێغەمبـەرانی خوا — عليهـم الصلاة والسلام — کـە سەرکردەی

ئایینی خـوانو بێوچان بەرنامەی خوایان گەیاندووە بە بـەرەی ئادەمیزاد هیچ کات چاوەڕوانی پارەوپوول نەبوون لەلایەن خەڵکەوە ٠٠ نەك هەر ئەمە بەڵکو بە ئاشکرا فەرموویانە :

«وما أسئلكم عليه من أجر ان أجرى الا على رب العالمين» ٠

ئێمە پوولو پارەمان ناوێ بماندەنێ ٠٠ پاداشمان تەنها لە خوا ئەوێ(١) ٠

بەڵام داخەکەم هەندێ کەس هەیە پەردەی ئایینی کێشاوە بە مل خۆیاو لە ژێریا ئەژی ، گوایا خـۆی تەرخان کردووە بۆ خوا پەرستیی ٠ خـەڵکیش وا تێگەیەنراوە کە ئایینی ئیسلام وای داناوەو ئەبێ کۆشکێکیشی بۆ برازێنرێتەوە٠ لایەکی بۆ خۆیو ٠٠ لایـەکی بۆ میوانە بەرزەکانی ٠٠ لایـەکیشی بۆ ئەجەرو گوجەر ٠٠!! ٠

سەرەڕای ئەمانەیش خەلیفەکانی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ خەڵکیان لە مزگەوت ئەکـردە دەرەوەو ئەیاننـاردن بـۆ ئیشو کاسـپیی ٠٠ هـەر وەك خۆیشیان لە مەدینەدا زەوییان بەکرێ ئەگرتو ئەیـانکرد بە کشتوکاڵ ٠٠٠ ئیتر چاوەڕوانی ئەمو ئەو نەبوون چونکە قوتابیی ڕاستەقینەی ئیسلام بوون ٠

ئەیانزانیی کە : «خوا بەندەی ئیشکەرو پیشەسازیی خۆشئەوێ» ٠

ئەیانزانی هەوڵدان بۆ ژیان بە «جیهاد» دائەنرێ ٠

«وابتغ فيما آتاك الله الدار الاخرة ولا تنس نصيبك من الدنيا وأحسن كما أحسن الله اليك ولا تبغ الفساد في الأرض ان الله لا يحب المفسدين» القصص/٧٧ ٠

---

(١) سەرێك لە زنجیرەی پێغەمبـەران بدە لە سوورەی «الشعراء»دا بـۆ ئەم مەبەستە ٠

## پەیوەندیی کرێکار بە خاوەن کارەوە

بۆ بتەو بوونی پەیوەندیی کرێکارو خاوەن کار بە یەکەوە ، وە بۆ ئەوەی خـاوەن ئیش متمـانەی ببێ بـە ئیشکـەر ئـەبێ سـنووری مـافی هـەردوولا بزانرێ !

ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر بە چاوی رێزەوە تەماشای کرێکار ئەکات ، وە دوای هەڕەشەکـردن لێی سەبارەت بە گزیی‌و خەیانەت کـردن ٠٠ زۆریش داوا ئەکات لە خاوەن کار کە چاوپۆشی ببێ لـە ئاستیان ٠٠ «پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ــ صلى الله علیـه وسـلم ــ ووتی : چـۆن چاو پۆشیی بـکەم لە بەندەی کارگوزارەکەم ؟! وە تا چ سنوورێ لە تاوانی خۆش ببم ٠٠؟ پێغەمبەر ــصلى الله علیه وسلم ــ فەرمووی هەموو رۆژێ (٧٠) حەفتا جار لێی خۆش ببە ٠٠»(١) ٠

واتە ئەگەر کرێـکارێکت بوو هەڵەیەکی کرد گورج دامەخورە بـە سەریاو دەوریەکە ، بەڵکـو ئەبێ عەفـوو لێبووردنت هـەبێ ٠٠ نـەك هەر ئەمـە بەڵکو هەروایش نیشان مـەدە تۆ خـاوەن ئیشیت‌و ئـەو ژێردەستەیە با لـە ئەنجامدا جیاوازیی دروست نەبێت لەناو کۆمەڵدا : ئەوە چینی دەوڵەمەندە ، ئەوە چینی کرێکارە ، ئەوە چینی هەژارە ٠٠٠ وە هەروەها ٠٠ سەرئەنجام قسەسەری یەکتر بووەستێن وەك سەدەی بیستەم ٠٠!!

ئیسلام ئا بەو جۆرە سۆزو بەزەیی ئەروێنێ لە دڵو دەروونی خاوەن کارا بەرامبەر بە کارگوزار ٠

لە فەرەنسەیش ــ کـە قیبلەی هەنـدێ کەسە ــ کارگوزار هـەر ناوێرێ بکەوێتە قسەوە لەگەڵ خاوەن کاردا ٠٠٠!

---

(١) الاسلام والمناهج الاشتراكية ، ل٢١٦ ٠

«پیاو ماقوولێکی فەرنسەویی بە نۆکەرەکەی خۆی وت : فلانە شت بکە ، ئەویش وتی : بەڵێ گەورەم فەرمانت بەجێیە ••• ئەو پیاوە نەجیبو هەڵکەوتووە !! دەماری لاملی هەڵساو وتی : چۆن ئەوە ئەڵێیت بەڵێ •••؟! نەکەی جارێکیتر بەڵێ بکەیت ، چونکە هەرکەسێ بەڵێ بکات ئەتوانێ ووشەی (نا)یش بەکاربێنێ»(١) •

وە هەروەها پێویستە کرێکار شوێنی حەوانەوەی بۆ مسۆگەر بکرێ بۆ راگیرکردنی باری تەندروستییان ، چونکە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەفەرموێ :

«خانووی گەورەو پاکو خاوێن هۆی ژیانی بەختیاریی‌و ئاسوودەییە ، وە خانووی تەسکو تەنگ ئەبێتە هۆی نەخۆشیی‌و نادروستیی ••»(٢) •

برای بەرێزو خۆشەویستم :ـ

١٤٠٠ ساڵە ئیسلام ئا بەو جۆرە مافی کرێکاری دیاریی کردووە ، وە چارەسەری گیروگرفتەکانی کردووەو خەلیفەی موسڵمانانی کردووە بە بەرپرسیار وەك ئەفەرموێ :

«الامام راع ، وهو مسؤول عن رعيته» •

واتە :

پێشەوا لێپرسراوە لە هەموو گۆشەیەکی ژیانیی کۆمەڵ • بەڵام لە هەموو جیهاندا بیر نەکرابووەوە لە ژیانی چینی هەژار ، نەك هەر ئەوە بەڵکو هەر بە خەیاڵدا نەهاتووە ••• لەم دوا دواییەدا نەبێت •• لە شۆرشی فەرەنسەوە دەستی پێکرد ساڵی (١٧٩٣) ، ئەویش لە ماددەی (٢١) بیستو یەکدا هەر ئەمەندەی ووت :

---

(١) سەرچاوەی پێشوو • ل٢٢١ •

(٢) الاسلام والمناهج الاشتراكيه •

«لەسەر شانی کۆمەڵە ئامێری ژیان پێکەوە بنێت بۆ هاو وولاتییە هەژارەکان» •

ئەمەیش تەنها قسەی ڕووت بوو و نەچووە خانەی کردارەوە •••(١)

هەروا مایەوە تا ساڵی ١٩١٧ •• ئەویش لە یەك وولاتدا بەم کارە هەڵسان ••(٢)!!

## شەشەم : سەربەستیی لە موڵکایەتیدا :

موسڵمان ـ بەڵکو هەموو مرۆڤێك کە لە ژێر ئاڵای ئیسلامدا بێت ـ سەربەستە بۆ پێکەوەنانی هەموو جۆرە دارایی و سامانێك ، هەرچەندە خۆی حەزی پێ بکات ، وە کەس بۆی نییە بەرگری بکات ، لەمەیشدا هۆیەکانی بەرهەمی و کەرەسەی تێچوونی (وسائل الانتاج والمواد الاستهلاكية) وەك یەك وان بە مەرجێ لەو یاساوە بڕوا ئیسلام بۆی نەخشە کێشاوە سەبارەت بە بەدەست هێنانی دارایی • بۆ چەسپاندنی ئەم وتەیە کۆمەڵە ئایەتێك ئەخەمە پێش چاوت :

«للرجال نصيب مما اكتسبوا وللنساء نصيب مما اكتسبن»(٣) •

«وآتوا اليتامى اموالهم ولا تتبدلوا الخبيث بالطيب»(٤) •

---

(١) ئەتوانین بڵێین شۆڕشی فەرەنسە هەر وتەیەکی چاکی لێوە دەرچووبێ لە ئیسلامی دزیوە دوای ئاڵوگۆڕ کردنی وشەکانی •• بەڵام ئەوەندە هەیە ئیسلام هەموو بەڵێنێکی بردە سەرو فەرەنسەیش تەنها وتەی ڕووت بوون •• بەڵکو لە دوا دواییدا پێچەوانەی بڕیارەکانی هەنگاوی هەڵگرت کە بە ناوی مافی ئادەمیزادەوە دەری کردن •

(٢) العمل والضمان الاجتماعي في الاسلام • د• صادق مهدي السعيدي •

(٣) سورەی النساء/٣٢ •

(٤) سورەی النساء/٢ •

«واما الجدار فكان لغلامين يتيمين في المدينة ...»(١)

بۆیه هەرکەس هێرشی بردە سەر ساماني هەرکەسێك ئیسلامی پیرۆز تۆڵەی لێ ئەسێنێ ..

«والسارق والسارقة فاقطعوا ايديهما جزاء بما كسبا نكالا من الله»(٢) .

وە هەروەها سامانێکیشی بە هۆی کەلەپووریەتیی‌و میراتە وەدەست کەوێ ئیسلام ددانی پیادا ئەنێت ، ئەمەیش بە پێچەوانەی هەندێ بیرو باوەڕەوە کە ئەوان بە ماڵی دەوڵەتی دائەنێن .

«يوصيكم الله في اولادكم للذكر مثل حظ الانثيين»(٣) .

هەموو مرۆڤێك ئازادە دارایی‌و سامانەکەی پەرە پێبدا بەڵام لە چوارچێوەی ئیسلام دەرنەچێت .. زەویی بکێڵێ‌و بیکا بە کشتوکاڵ ، کەرەسەی خاو بەکار بێنێ لە کارگەی پیشەسازییدا ، سەربەستە بازرگان بێت ، ئاسنگەر بێت ، دارتاش بێت ... هەتد بەڵام بۆی نییە گزیی‌و خەیانەت بکات ، وەیا ئەو شتانەی پێویستیی ئادەمیزادن بیبیان‌شارێتەوەو (ئیحتکار)یان بکات ، وەیا دارایی بدات بە سوود ، یا کرێی کرێکار بە رێك‌وپێکیی نەدات .. ئەمانە هەموویان لە ئیسلامدا یاساغن . ئەمەش کۆمەڵێ لە فەرموودە بەنرخەکانی سەردارو پێشەوای ئادەمیزاد :

«من غش فليس مني»(٤) .

«من احتكر فهو خاطيء»(٥) .

---

(١) سورەی الکهف/٨٢ .
(٢) سوورەی المائدە/٤٢ .
(٣) سوورەی النساء/١١ .
(٤) اصحاب السنن .
(٥) مسلم وابو داود والترمذی .

«لعن رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ آكل الربا وموكله وكاتبه وشاهديه وقال : هم سواء» •

به مانای هەرکەسێك یارمەتیی سوود خۆر بدات به هەر شێوەیەك بەر نەفرینی خوا بکەوێ •

ئەوابوو ئەگەر شتێکی بەدەست خست ـ وەك سوود خواردن‌و شەروال پیسیی‌و عەرەق فرۆشیی‌و زەوت کردن‌و بەرتیل‌و فێڵ‌و تەڵەکەکانی‌تر •

ئەوانە هیچیان نابن به ماڵی ، چونکه لـه رێگەیەکی ناپەسەندەوە پەیدا کراون‌و زیانی هەندێ ئادەمیزادی تیایە •

کاتێ ئەڵێین مرۆڤ له ژێر ئاڵای ئیسلامدا ئازادە بۆ پێکەوەنانی دارایی ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ ئیسلام ڕازیی بێت بـه یاسای ئابووریی سەرمایەداریی چونکه ئیسلام :

یەکەم : به هیچ جۆر بەلایەوە پەسەند نییە دارایی لای هەندێ کەس کۆببێتەوە وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە بێ پێچوپەنا ئەیگەیەنێ :

«ما أفـاء الله على رسـوله من أهـل القرى فلله وللرسـول ولذي القـربى واليتامى والمساكين وابن السبيل كي لا يكون دولة بين الأغنياء منكم»(١) •

واته ئەو دێهاتانـەی کـه به جەنـگ نەگیـراوون ، ماڵ‌و موڵکیـان بەم شێوەیە دابەش ئەکرێ :

١/٥ی ئەکرێ به پێنج بەشەوە :

أ ـ بەشێکی دائەنـرێ بۆ خواو پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليـه وسلم ـ دوای خۆیشی له بەرژەوەنـدیی گشتیی موسلماناندا سەرف ئەکرێ بـۆ ئەوانەی

---

(١) سوورەی الحشر •

خزمایەتیی نزیکیان هەیە لەگەل پێغەمبەردا ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ ٠

٣ ـ بۆ هەتیوان ٠

٤ ـ بۆ بێ‌نەوایانو بێچاران ٠

٥ ـ بۆ ڕێبواران ٠

٦ ـ چوار بەشـەکەی‌تریشی هینی پێغەمبەرە ـ صلی‌الله علیـه وسلم ـ تا خۆی مابوو ئەیدا بـە کۆچەرییەکان ٠٠ ئێستایش کە ئەو نەماوە ئـەدرێ بەو لەشکرەی لەلایەن دەولەتەوە مووچەی بۆ نەبڕاوەتەوە ٠

ئەم مالە بەسەر ئەم هەژارانە دابەش ئەکرێ نەك بەسەر دەولەمەندەکانا تا ئەو دەستکەوتە هـەر بەدەست دەولەمەندەکانتانەوە نەبێ ، وە هـەر ئەوان دەستاو دەستی پێ‌بـکەنو قازانجی لێ‌وەرگرن بەبێ هەژارەکان ٠

ئەم ئایەتە «کي لا یکون دولة بین الاغنیاء منکم» :

بەشێکی زۆر نیشـان ئەدا لـە بنیاتی بیینیـە «نظریة»ی ئابـووریی لە ئیسلاما ، لـەم بیینیەیەدا دان نراوە بە خاوەنێتیی تاکیی «الملکیـة الفردیة»دا ، بەلام بەو مەرجەی کە لە سنووری ئەم دەستوورە دەرنەچێ ، بەم ڕەنگە ئەو مالە نەبێ بە گەردان لەناو دەولەمەندانا ، وە هەر جۆرە کردەوەو دابەشکردنێك سەر بکێشێ بۆ ئەوەی کە مال ببێ بە گەردان لەناو دەولەمەندانا ، ئەوە پێچەوانەی بیینیەی ئابووریی ئیسلامی‌یە ٠

بەلێ ئیسـلام کە هات ، لەسـەر ئەم دەسـتـورە بنیاتی خۆی دانـا ، بەم ڕەنگە زەکاتی پێویست کرد ، وە لە سەدا ، سالی دوو و نیوی دانا لەسەر دەست مایەیەك کە پارەبێ ، وە لـە سەدا پێنج ، یا دەی دانا لە هەمـوو بەروبوومێکی کشت‌وکالا ، وە بە قەد ئەوە لە ئاژەلا ، وە لە دەستکەوتی جەنگییی (غنیمە)دا ٠٠ وە ڕێی داوە بـۆ سەرۆکی موسلمانان کـە زیادە مالی دەولەمەنـد وەربگرێو

دابەشی بکات بەسەر هەژاراندا ، وە بە مانگانە بییدا بە مووچە خۆرانی دەوڵەت لە کاتێکا کە خەزێنەی دەوڵەت هیچی تیا نەبێ ٠

خولاسە ئیسلام دەستووری ئابووریی خۆی دانا لەسەر ئەم بناغە گەورەیە ، وە بەم بنیاتەو گەلێ شتی‌تر ، مافی خاوەنێتیی تاکیی لە زۆر ڕووەوە بەستەوە ٠٠٠(١) ٠

دووەم : ئیسلام داوا ئەکات لە کۆمەڵی ئادەمیزاد کە نەرمو نیانییو بەزەییو سۆز بەکار بێنن لەگەڵ چینی هەژارو بێنەواو هیچ نەبوواندا ، بۆ ئەمە سەیرێکی ئەم ئایەتە بکە ، چەند هەڕەشەی تیا بەدی ئەکەیت دژی ئەوانەی دارایی کۆئەکەنەوەو بەشی هەژاران نادەن :ـ

«والذين يكنزون الذهب والفضة ولا ينفقونها في سبيل الله فبشرهم بعذاب أليم»(٢) ٠

بە مانای ئەوانەی زێروزیو کۆئەکەنەوەو بەشی هەژارو بێنەوایانی لێنادەن ٠٠ وەیا لە پرۆژەی خێرییدا سەرفی ناکەن ئەوانە مژدەی سزای سەختیان بدەرێ ٠٠!!

سێهەم : پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ لە فەرموودەیەکیا هاتووە :

«ناچێتە بەهەشتەوە (بەر ڕۆو قینی خوا ئەکەوێت) ئەوی بە تێریی شەو سەر بنێتەوە ٠٠ کەچی دراوسێکەی هاوارو زگی هەڵگوشیینیی‌بێ لەبرسا !» ٠

یان ئەفەرموێ : «هەمووتان وان لەژێر چاودێری خوادا ، وە خۆشەویست ترتان لای ئەو ئەوەتانە کە کەڵکی زیاتر بێت بۆ بەندەکانی ئەو ٠٠» ٠

وە ئەفەرموێ بە دایکی موسڵمانان خاتوو عایشەی خێزانی : [ئەگەر چێشتت لێنا ئاوی زۆری تێبکەو بەشی دراوسێکانتی لێبدە] ٠٠ وە جارێ بە یارە شیرینەکانی فەرمووی :

---

(١) تەفسیری خاڵ ، ل٣٠ـ٣١ ، بەرگی بیستو هەشتەم ، چاپی یەکەم ٠
(٢) سوورەی التوبه/٣٤ ٠

«ئەزانن هەقی دراوسێ کامەیە ؟ ••• ئەگەر میوەیەکت کڕی بەشی بدەیت، یان پێی نەزانێ‌و منداڵت نەیباتە دەرەوەو منداڵەکەی خەفەتی پێ بخوات ، وە بە بۆن‌و چزەی مەنجەڵەکەت ئازاری مەدە ، یان بۆی بنێرە ••» •

به کورتی :

موسڵمان بە هیچ جۆر ئاگاتە پلەی سەرمایەدار ، چونکە ئەوەندە ڕۆژەو نیشی چاکەی بۆ دانراوە بیکات داراییەکی ئەوتۆی نابێت !(۱) •

## بینینەی ئیسلام لە ساماندا

ئیسلام لەگەڵ ئەوەیشدا کە سەربەستی داوە بە ئادەمیزاد بۆ پێکەوەنانی دارایی بە ئارەزووی خۆی‌و هەرچەندەی پێخۆشە لەگەڵ ئەمەیشدا دارایی نەکردووە بە تایبەتمەندیی (اختصاصی)ی هیچ کەسێك •• واتە کۆمەڵێ دەستی بەسەرا بگرن‌و بە ئارەزووی خۆیان بەشی هەژاران بدەن •• نەخێر چونکە موڵك موڵکی خوایە کەواتە کەس بۆی نییە بڵێ :

«کرێ‌و پاداش بە ئەندازەی ئیشە ••» وە هەروەها ئیسلام ئەڵێت :

«مرۆڤ بە تێکرا خاوەن مافە لەو سامانەدا خوا کردوویەتی بە هۆی ژیانی ئادەمیزاد ئیتر ئیش بکات یا نەء ••• وەك خەلیفەی دووەمی موسڵمانان ئەمەی ڕۆشن کردەوەو فەرمووی :

«وان لا یبقی احد من المسلمین وان کان في بیته الا اتاه حقه ونصیبه من مال الله ، وان لم یعمل الیه نفسه ولم ینصب الیه بدنه ••» •

---

(۱) سەعدای کچی عەوف ـ کە خێزانی طەلحەی کوڕی عەبدوڵلایە خوا لێیان ڕازی بێت ـ ئەگێڕێتەوە ئەڵێت : ڕۆژێکیان چوومە ژوورەوە لای طەلحە•• بینیم خەم‌و پەژارە دایگرتووە ، لێم‌پرسی ئەوە چیتە ؟ وتی : ئەو ماڵ‌و سامانەی کە هەمە ئەوەندە زۆربووە پەژارەو ترسی بۆ پەیدا کردووم • خێزانەکەی ئەڵێ : چیت ماوە ببەخشەرەوە ، ئەویش هەڵساو خەڵکی بانگ کردو دەستی کرد بە دابەشکردنی «هەتا درهەمێکی بۆ نەمایەوە» •

خۆ بێجگه لەمەیش هەندێ ماڵ هەیە دروست نییە بۆ تاك دەستی بەسەرا بگرێ ، چونکە هۆی ژیانن بە تێکرا بۆ هەموو کەس • پێغەمبەری خۆشەویستمان ـ صلى الله عليه وسلم ـ سێیانیانی بە تایبەتی ناو بردن :

«الناس شركاء في ثلاث : في الماء والكلأ والنار»(١) •

وە هەروەها هەر شتێکی‌تر وەك ئەوانە سەرچاوەی ژیانی کۆمەڵ بن ••

«ئەو کان (معدن)انەی کە بەدەرەوە بنو بەبێ زەحمەتی کەس کەرەستەکەیان لێ وەربگیرێ ، هەرچەند زەحمەت لە کولاندنو دەرکردنیا بێ وەکو نەوتو گۆگردو قیرو مۆمیاو بەردی مەرمەرو بەردی یەشمو بەردی بەرداش ، ئەمانە نابن بە موڵکی کەس بەهۆی ئاوەدان کردنەوەی ئەو شوێنەوە کە ئەم کانانەی تیایە ••• چونکە ئەمانە بە پێی شەرع بۆ قازانجی گشتین ، وە هەموو کەس ئەتوانێ ئەوەندەی پێویستی خۆی سوودیان لێوەربگرێ ••»(٢) •

ئێمە کە ئەڵێین : لە ئیسلاما وایە ئەبێ هەموو مرۆڤێك بەخێو بکرێ ئیش بکات یان نە؟ ••• ئەمە مانای ئەوە نییە ئیتر مرۆڤ پاڵی لێبدەتەوە لە ماڵی خۆیداو میری بیکا بە کلاورۆژنەکەیدا •• نەخێر چونکە ئیسلام پێویستی کردۆتە سەرشانی مرۆڤ بە پێی توانا دەرامەت بەدەستخات بۆ وڵات ! لەبەر ئەوەنا تا دەوڵەت بیژییەنێ ، بەڵکو لەو رووەوە کە کارکردن لە ئیسلاما زۆر بەنرخەو ئەبێ ئادەمیزاد بە پێی توانا پێی هەڵسی ، چونکە ووڵات بە ئیش‌وکارو بەرهەم بەرەو پێشکەوتن ئەڕوات ••

تیووریکی تری ئیسلام لە ساماندا ئەوەیە کە :

دەوڵەت مافی بەسەر «بيت المال»ەوە وەك چاودێریکەری هەتیو وایە •• بەو مانایە ئەگەر خۆی دەسەڵاتی ژیانی بوو ، ئەوە چاك وایە لە سامانی

---

(١) خاوەنی «مصابيح السنة» لە «الحان»دا باسی کردووە •

(٢) شەریعەتی ئیسلام ، بەرگی دووەم ، ل٢٨٤ ، دانراوی مامۆستا مەلا عبدالكريمی مدرس • خۆیشت ووردبەرەوە هەندێ شتی‌ترت بۆ روون ئەبێتەوە •

هەتیوەکە هیچ نەخوات ، وە ئەگەر شتێکی ئەوتۆی نەبزو ، ئەوە کۆمەڵ بە پێی یاسای ژیان شتێکی بۆ دیاریی ئەکات ٠

لەم یاساوەوە ئەمە وەرئەگیرێ کە مووچەخۆر ـ لە گەورەترینەوە بۆ بچوکترین ـ ئەبێ بە گوێرەی پێویستی خۆیو خێزانی مووچەی بۆ دیاریی بکرێ ، خۆ ئەگەر خاوەن سامان بوو ئەبێ بە خۆڕایی خزمەتی کۆمەڵ بکات ٠

لەوانەیە لێرەدا کەسێك بڵێت : مووچەخۆر چۆن بەخۆڕایی ئیش ئەکات ؟!
ئەڵێین : ئەو کە خاوەنی داراییو سامانە ، وە ئەتوانێ لە دەرەوەی ئیشە (وظیفە)کەیەوە بژی ٠٠ ئیتر ئارەزووی خۆیەتی ئیش ئەکات بە خۆڕایی یا بیکات ٠٠ ئەگەر نە دەزگاکە چۆڵ بکات با هەژارێك بخرێتە جێگاکەی تا بتوانێ خاوو خێزانی بژێنێ ٠٠ !

ئینجا لەمەوە خاڵێکی ئیجگار گەورەو ڕێویست دروست ئەبێ لە بەردەم دەوڵەتا بۆ دابەشکردنی ئیشو کارو دامەزراندنی (بێکارە = بطالة) چونکە کاتێ دەوڵەت کەسێ دانەمەزرێنێ کە بتوانێ خۆی بژێنێ لە دەرەوەی دەزگاکەوە ئەنجام یەکێ لەم دووخالە ئەبێت :ـ

١ ـ کارگێرانی دەزگاکان ٠٠ ئەوانەیان خاوەن دارایین ـ بە خۆڕایی ئیش ئەکەن ٠

٢ ـ وە یا مەڵبەندەکان چۆڵ ئەکەن ٠٠ ئینجا میری ئەتوانێ بە هەزاران هەژارو بێکارە دامەزرێنێ ٠

جا ئەگەر بڵێین : کە وابوو سەربەستیی نەبوو لە ئیسلامدا ٠٠!! ئەڵێین :

جا تۆو خوا ڕەوای حەقە کەسێك دەرامەتی مانگانەی ، وەیا سالانەی بە سەدان دینار بێت ، یا هەزارەها ڕەوای حەقە ئەو کەسە بخرێتە سەر ئیشوکار٠٠ کەچی هەژارێکی بێ نەواو هیچ نەبوو بێ ئیش بسووڕێتەوەو ماڵو منالیشی بێ تفاق بن ٠٠؟!

ئەگەر ئەڵێت دەبا هەردووکیان دامەزرێن ٠٠ ئەڵێین با دامەزرێن ٠٠ بەلام

ئەی ئەگەر جێگای بۆش نەبوو چەندان هەژاریش بێ ئیش بوون ..؟! .

برای بەرێزم :ـ

ئەمە هەندێـکی کەم بوو لە بیینیـەو رای ئیسلام دەربارەی بـووژانەوەی، بێچاران خۆ ئەگـەر بتەوێ زیاتر ڕاستیت بۆ دەرکەوێ چاکی مەردایـەتیی لێ هەڵکەو ڕەگەز پەرستیی‌و لایەنگریی بخەرە ئەولاوە .. ئینجا بڕێت دەرئەکەوێ ئەوانەی لافی ئەوە لێئەدەن کە خەمخۆری چینی کرێکارو (پرۆلیتاریا)ن هیچیان بەسەر هیچەوە نییە چونکە ڕۆژگار هەموویانی کردن بە بێژنگ‌داو هەریەکەیان سەرە گوریسێکی کەوتە دەست کەچی بە هیچ جۆر ئاووڕێکی نەدایەوە بە لای ئەوانەدا کە بە ووشەی زلەزلـە فریبی دابوون .. نەك هەر ئەوە هەتـا (کاکەو خاڵە) مابێ ئەمانی ـ فریبدراوەکانی ـ بیر ناکەوێتەوە !

# دابەش‌کردنی هۆیەکانی ژیان

ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ ئەم بابەتە یاسای گرنگ‌و قەشەنگی هێناوە ·
واتە بۆ دابەشکردنی هۆیەکانی ژیان بەسەر کۆمەڵو تاکدا بە گوێردی پێویستیی
خێزان‌و بنەماڵە تا بەڵکو تەرازووی ژیان لارسەنگ نەبێت ·

بەڵێ ·· کاتێ پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ
مەدینەی پیرۆز (یارمەتی‌دەرەکان) لەوپەڕی خۆش‌گوزەرانییا بوون ، چونکە
ئەوان وەك کۆچکەرەکان دەربەدەر نەکرابوون‌و ماڵ‌و دارایی‌یان لێ زەوت
نەکرابوو ·· بۆیە یارمەتی‌دەرەکان بیروباوەڕی ڕاستەقینەیان پاڵی پێوەنان بۆ
یارمەتی‌دان‌و دەستگیرۆیی کۆچکەرەکان بە شێوەیەك زۆر جار باسیان ئەکرد بۆ
پێغەمبەرو ئەیان‌وت : «تا ئێستا هیچ کۆمەڵێکمان بەرچاو نەکەوتووە وەك ئەم
یارمەتی‌دەرانە ، دەوڵەمەندەکانیان خاوەن بەخشش‌و هەژارەکانیان خاوەن
پیاوەتین ··» لەگەڵ ئەمەیشدا پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ هەر لە بیری
ئەمەدا بوو کە چۆن ژیانی کۆچکەرەکان ڕاست بکاتەوەو وەك ئەنصارەکانیان لێ
بکات(١) ·

بۆ یەکەم‌جار کە موسڵمانەکان سەرکەوتن لە جەنگی (بەدر)ا هەرچی
دەسکەوت بوو دابەشکرا بەسەر هەردوولایاندا بێ‌جیاوازیی ، چونکە نەئەکرا بە
گورجیی (ئەنصار) بێ‌بەش بکاو هەمووی بدات بە کۆچکەرەکان ·· نەوەك دوو
بەرەکیی‌و ناکۆکیی ڕووبدات لەناویاندا ·

بەڵێ لەم جەنگەدا بەم شێوەیەی کرد بەڵام ـ وەك ووتمان هەر لەو بیرەدا
بوو کە ژیانی کۆچکەرەکان ڕاست بکاتەوە ·· بۆیە لە ڕووداوی (بەنی نەزیر)دا
باری ئابووریی گۆڕی ·· هەڵسا هەرچی دەستکەوت بوو لەم جەنگەدا دای بە
کۆچکەرەکان‌و ئەنصاری بێ‌بەشکرد ·

---

(١) الاسلام والمناهج الاشتراكية/محمد الغزالي ·

(زەهری) ئەڵێت : دەسکەوتی ڕووداوی (بەنی نضیر) بەشی پێغەمبەر بوو بە تەنها چونکە بە شەڕو هەرا نەگیرابوو تا بدرێ بە جەنگاوەرەکان ٠٠ بۆیە پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ دابەشی‌کرد بە ناو کۆچکەرەکاناو ئەنصاری بێبەشکرد ، دوو کەسی هەژاریان نەبێت ٠٠» ٠

پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ زۆر بە حیکمەت خەریك ئەبوو بۆ یەکسان کردنی ژیانی کۆچکەرەکانو یارمەتی‌دەرەکان ، بۆ ئەوەی ئەوان هەست نەکەن ٠٠ نەوەك ئاژاوە دروست ببێ ٠٠!! ٠

ئەوەبوو هەمووجار پێخۆشحاڵی خۆی دەرئەبڕی بۆ یەکسانکردنی باری ئابووریی لەسەر بناغەیەکی دادپەروەرانە ، وە وای ئەخستە پێش چاو کە ئەو وای پێخۆشە سامانو زەویی ئەم دەستو ئەو دەست بکات ، وە بە پێی پێویست ئاڵو گۆڕی پێبکرێ ٠٠ بۆ ئەوەی موسڵمانان وەك یەکیان لێبێت لە باری ئابوورییدا ٠

(جابیری کوڕی عەبدوڵلا) ئەڵێت :

«هەندێکمان زەوییوزاری زۆریان بوو ٠٠ (واتە زیاد لە پێویست) ئەوانیش ئەو زیادەیان ئەدا بە کرێ یا بە سێیەك ، وەیا بە چواریەك ، یا بە نیوەیی (لەولایشەوە زۆر کەس بوون بێدەرامەتو زەویی) ئینجا پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ فەرمووی :

ئەو کەسەی زەویی هەیە ٠٠ یا خۆی بیکێڵێ ٠٠ وەیا بیدا بە برا موسڵمانەکانی با ئەوان بیکێڵن بە خۆڕایی بۆ خۆیان ٠٠ وە ڕازیمان نییە بە کرێ بییاندەنێ ٠٠»(١) ٠

لەم فەرموودەوە وا بەدی ئەکرێ کە پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ ئەیەوێ بیدا بە گوێی خاوەن موڵکەکانا بفەرمێت : من وام پێخۆشە ئەوەی زەویی هەیەو زیادە لە خۆی ، نەیخەوێنێ بێ دەرامەت ، بەڵکو هەژارەکان بانگ

---

(١) الاسلام والمناهج الاشتراكية ، ل١٠٥ـ١٠٦ ٠

بکاتو بەشی ئەوانیشی لێ بدات •

(ئیبنو عەبباس) ئەم دەبەستە بەهێز ئەکاتو ئەفەرموێ :

«جارێك پێغەمبەر ــ صلی‌الله علیه وسلم ــ بەلای پارچە زەوی‌یەکدا ڕۆیشت ــ بەرووبوومێکی زۆری هێنابوو ــ فەرمووی : ئەمە هی کێیە ••؟ ووتیان : فلانەکەس بەکرێی گرتووە • فەرمووی : «ئەگەر بە خۆڕایی‌و بەخشش پێی بدایە چاکتر بوو لە کرێ وەرگرتنی» •

بەڵێ : ئا بەو جۆرە پێغەمبەر ــ صلی‌الله علیه وسلم ــ وردە وردە بەرەو دامەزراندنی یاسای ئابووریی هەنگاوی نا •• بەڵام زۆر زۆر بە حەکیمانەو لێزانین ، سەیر بکە یەکسەر نەیفەرموو ئەو کەسەی زەویی هەیە زیاد لە خۆی ئەبێ بیداتە دواوە •• چونکە ئەو سەردەمە سەرەتای نەشوونیمای موسڵمانان بوو •

لەولایشەوە ئەوانەی خەریکی کشتوکاڵ بوون لە (ئەنصار) بوون ئەوانیش ــ خوا پاداشیان بداتەوە ــ ئەوانە بوون کە بەخشش‌و دەهندەیان لە لاپەڕەکانی مێژوودا تۆمار کراوە ، وە قورئان لە جێگەی ستایشدا باسی ئەکات‌و ئەفەرموێ :

«••• یحبون من هاجر الیهم ولا یجدون في صدورهم حاجة مما أوتوا ویؤثرون علی انفسهم ولو کان بهم خصاصة •••»(١) •

ئەوەی هاتووە بۆ لایان (لە مەککەوە) خۆشیان ئەوێ ، وە شك نابەن لە دڵی خۆیانا هیچ جۆرە حەسەدێك بەوەی کە دراویانەتێ ، وە باوی ئەوان ئەدەن بەسەر خۆیانا با خۆشیان زۆر پێویست بن •

کۆمەڵێك لە خاوخێزانی بگرێتەوە بۆ بێچاران ، وە سەرف بکات لە ڕێگەی خوادا زیاد لەوەی داوای لێ بکرێت ، وە پێویستی‌یەکانی خەڵك پێش بخات بەسەر

(١) سوورەی الحشر/٩ •

هیی خۆیدا ۰۰!! ئایا دوای ئەوە ناحەقی نییە زۆری بۆ بخرێتە کارو هەڕەشەی لێ بکرێ ۰۰؟ ئایا ڕەوای هەقە زەویی و کێڵگەی لێ وەربگیرێتەوەو بدرێ بەم چینەکەی تر ۰۰؟!! ۰

بێجگە لەوەیش موسڵمانانی پێشوو ـ خوا لێیان ڕازیی بێت ـ بە جۆرێ یارمەتی هەژارو بێنەواکانیان ئەدا ، وە دەستی یارمەتییان بۆ درێژ ئەکردن ، ئیتر بە دڵ هەژارەکانا نەئەهات ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەبێ زەوییوزار دابەش بکرێ، چونکە زیاد لە پێویست خزمەت ئەکران ، بۆیە پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ بێ پێچوپەنا نەیفەرموو ئەوەی زیادەی هەیە لە خۆی ئەبێ بیدات بەو کەسەی کە هیچی نییە ۰

کۆمەڵێك تا بەو جۆرە بێت ئاشکرایە کە هیچ یاسایەك دەستی بۆ نابات بەڵام ئەگەر سۆزو بەزەیی نەما ۰۰ دەستی یارمەتی نەما ۰۰ عەدالەتو داد نەما ۰۰ دەوڵەمەند دەستی هەر بە گیرفانی خۆیدا ئەکرد ۰۰ وە ئاورێکی نەئەدایەوە بەلای هەژارو چەوساوەکانا ۰۰ پێیخۆش بوو تەنها خۆی بیخوات۰۰ ئەو سەرکردەی ناوچەو وولات بێ ، دانیشتوان سێیەکو چواریەك خۆری ئەو بن ۰۰ !! ئەوە لەم کاتەدا کە زنجیرەی برایەتییو یارمەتی پچڕاوە ۰۰ ئەبێ دەسەڵاتداریی میریی ـ بە ناوی خواو پێغەمبەرەوە ـ دەست بکێشێتە مەسەلەکەوە بۆ پیادە کردنی فەلسەفەی ئایەتی «كى لا يكون دولة بين الاغنياء منكم ۰۰۰» ۰

هەروەك خەلیفەی دووەم ـ عومەری کوڕی خەتتاب ـ هەڵسا بەم ئیشە گرنگەیە بەم شێوەیە کاتی خۆی پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ پارچەیە زەویی دابڕیبوو بۆ (بیلالی کوڕی حارث) بۆ ئاوەدان کردنەوەیو کردنی بە کشتوکاڵ ۰۰ ئەویش بۆی نەکرا لەبەر زۆریی زەوییەکە ، یا لەبەر هەر هۆیەکیتر ئینجا حەزرەتی عومەر بیلالی بانگکردو فەرمووی : فلانەکەس کاتی خۆی داوای زەویت کرد لە پێغەمبەر ۰۰ ئەوەبوو پارچەیەکی بۆ دیاریی کردی ، وا ئێستا دەسەڵاتت نییە بە سەریا ۰۰ کەوابوو تەماشا بکە بزانە چەندەت بۆ فەراهەم دێتو ئەتوانی بیکەی بە کشتوکاڵ بیکە ۰۰ وە ئەویتری بدەرەوە دواوە بۆ ئەوەی

دابەشی‌کەین بەسەر موسڵمانەکانا ••• بیلال وتی : بە خوا نایدەمە دواوە ، چونکە پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ بۆی دیاریی کردوم
عومەر فەرمووی :
بەخوا ئەبێ بیدەیتە دواوە ، ئینجا خەلیفەی موسڵمانان تەماشای کرد چەندەی زیادەیە لە بیلال لێی وەرگرتەوەو دابەشی‌کرد بەسەر موسڵمانەکانا ••»(١) •

## بیینیەی ئیسلام لە خۆماڵی کردن «تأمیم»دا

ئایینی پیرۆزی ئیسلام ڕێزی خاوەنێتی‌ی خۆیی گرتووەو مافی ئەپارێزێ‌و ناهێڵێ کەس دەست درێژیی بۆ بکات •• بەڵام ئەگەر هاتو کاتێکی ناچاریی هاتە پێشەوە ، وەك ئەوەی بەرژەوەندیی گشتی‌ی تێدابوو ئەوە لەم کاتەدا دروست‌و ڕەوایە بۆ دەوڵەت ئەو شتە لە خاوەنەکەی دارنێ‌و بیکا بە ماڵی خۆی تا هەموو کۆمەڵ سوودو قازانجی لێ‌بکەن ، لە باتی ئەوەی کە تەنها کەسێ سوودی لێ ببینێ •• جا ئەگەر دەوڵەت ئەمەی کرد پێویستە قەرەبوو «تعویض» بدات بە خاوەنەکەی بە مەرجێ موڵکیەتەکەی بە شێوەیەکی شەرعیی بووبێ ، ئەگینە ئەوەیش پێویست ناکات •
بەڵگە بۆ ئەمەیش ـ تامیم ـ پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ لە مەدینەدا پارچە زەوی‌یەکی دابڕی‌و کردی بە لەوەڕگەی چارەوێ‌و ووڵاغی موسڵمانەکان •
وە هەروەها خەلیفەی دووەم ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ پارچەیەکی جیا کردەوەو کردی بە لەوەڕگەی گشتی‌ی ، ئینجا خاوەنەکەی هاتو وتی :
ئەمیری موسڵمانان ! ئێمە ئەم خاکە لەسەردەمی نەفامییەدا جەنگمان لەسەر کردووە ، وە لە سەردەمی ئیسلامدا لەسەری موسڵمان بووین ، ئیتر تۆ لەسەرچی لە ئێمەی وەرئەگری‌و ئەیکەی بە لەوەڕگە ؟

---

(١) الاسلام والمناهج الاشتراكية ، ل١٣٩ •

خەلیفە سەرێکی داخستو فەرمووی : ماڵو سامان هی خوایە ، وە ئادەمیزاد هەمووی بەندەی خوایە ، سوێن بە خوا ئەگەر لەبەرخاتری جیهادو تێکۆشان نەبوایە لە ڕێگەی خوادا تەنها بستێ زەوییم دانەئەبڕی •

ئەمەو چەندەها بەڵگەو نموونەی ترمان بە دەستەوە هەیە بۆ بەرەوا دانانی یاسای خۆماڵی کردن ••(١) •

## سنوورێك بۆ خاوەنێتیی تاکیی

ئایینی پاکی ئیسلام مرۆڤی سەربەست کردووە بۆ پێکەوەنانی داراییو ڕاگیرکردنی شتوومەكو موڵکایەتیی خۆیی ، وەك لە پێشەوە کەمێك لەسەری ڕۆیشتین •

بەڵام ئەمە بە مەرجی ئەوەیە کۆمەڵ تووشی زیانو دەستکورتیی نەبێت لە پاڵ ڕابواردنو موڵکایەتیی تاکدا •• واتە ئەگەر گیروگرفت هاتە بەردەم کۆمەڵو ژیان لارەسەنگ وەستا ئەوە لەم کاتەدا دەوڵەت ئەبێ دەستکاریی ئەو خاوەنێتیی خۆییە بکاتو سنوورێکی بۆ دابنێ ! مەبەست لەمەدا زیاتر دابەش کردنو دەستکاریی کردنی ئەو پارچە زەوییانەیە کە بە زۆریی کۆمەڵێك دەستیان بەسەرا گرتوونو خەڵکەکەی تر لێی بێبەشەو کە ئێمە یاسای تایبەتییان بۆ داناوەو پێی ئەڵێن :

«یاسای چاك کردنی زەوییوزار ــ قانون الاصلاح الزراعی» • چونکە ئیسلام کاتی خۆی دەستکاریی ئەم جۆرە زەوییانەی کردووە ، وە بە گوێرەی پێویست ئاڵوگۆڕی پێکردوون ، وەك پێشەوای موسڵمانان عومەری کوڕی خەتتاب ــ خوا لێی ڕازیی بێت ــ زەوییەکەی سەندەوە لە (بیلالی کوڕی حارث)(٢) •

---

(١) سەیری «اشتراکیة الاسلام»ی مصطفى السباعی بکە ، ل١٠١ــ١٠٤ •

(٢) با بە وردی سەیری کتێبی : (الاسلام والمناهج الاشتراکیة)و (اشتراکیة الاسلام) بکرێ بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەم باسە •

## حەوتەم : سەربەستی‌ی لە جل‌و بەرگدا :

ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەرگای خستووەتە سەرپشت بۆ مرۆڤ ـ بەڵکو داوای لێئەکات ـ کە خۆی برازێنێتەوە بە جوانترین پۆشاك بێ ئەوەی جۆرێکی لێ یاساغ کردبێت ، واتە بێئەوەی بەرگریی بکات لە بەکارهێنانی سپیی ، یا رەش ۰ یا سوور ، یا هەر رەنگێکی تر بەو مەرجە لەو جێگەدا ئەو رەنگە ئافرەت بەکاری نەهێنی‌و تایبەتی‌ی ئەو نەبێت ۰۰!

بەڵام دوژمن بە خواو پێغەمبەر چاوبەستێکی‌تری ئەدەبوو بلاوی‌کردووە کە رەنگی سوور نیشانەی فلانەبیرو باوەڕە ، وە هەروەها سپی‌و رەش ۰ مەبەستی ژەهراوی‌یان ئەوەبوو کە ئاژاوەو پەرتەوازیی بکەوێتە نێوان عالەمی ئیسلامی‌یەوە ۰۰!

جل‌و بەرگ پێویستە بۆ ئادەمیزاد چونکە :

یەکەم : لەبەر شاردنەوەی ئەو ئەندامانەیە کە مرۆڤی سروشت پاك‌و رۆشنبیری راستەقینە بەلایەوە دەرخستنی لەکەو شووره‌یی‌یە لەناو کۆمەڵدا ۰۰ هەرچەند نەفامییێتی تازەی سەدەی بیستەم داکەندنی بەرگی شەرەف‌و پەردەی حەیاو شەرم بە پێشکەوتن‌و شارستانی‌یەتی دائەنێ !! ئەو ئەندامانەیش داپۆشینیان پێویستە شەریعەتی ئیسلام پێیان ئەڵێت : (عەورەت) عەورەتی پیاو لە نوێژا(١) مابەینی ناوك‌و ئەژنۆیەتی ۰

«عەورەتی ئافرەتیش هەموو لەشیەتی بێجگە لە دەم‌و چاوو هەردوو دەستی

---

(١) هەروا عەورەتی لەگەڵ پیاوو لەگەڵ ژنی مەحرەما ، بەڵام لەگەڵ ژنی بێگانەدا ئەوە هەموو لەشیەتی بە پێست‌و مووەوە ۰ عەورەتی لە خەڵوەتا تەنیا بەرو دوایەتی ئەگەر مەبەستێکی شەرعی بێ ئەوە دروستە تەماشایان بکا ۰ شەریعەتی ئیسلام ، بەرگی یەکەم ، ل٨٥ ۰

تا جمگەی مووچ(١) ٠٠ شەرتی پۆشاکەکە ئەوەیە مەنعی بینینی رەنگی پێستی عەورەت بکا ٠٠٠» ٠

دووەم : بۆ خۆئارایش‌دانە بە هەر جۆر بگونجێت بەو مەرجە لەچوارچێوەی بەرنامەی ئیسلام دەرنەچێت :

« یا بني آدم قد انزلنا علیکم لباسا یواری سوآتکم وریشا ٠٠ » ٠

ئایینی ئیسلام هەرەشـەی توندو تیژی کـردووە لەوانـەی لـە سروشت لائەدەن ، شەیتان هەلیـان‌ئەخەلەتێنیو پۆشـاکی شـەرمو کەرامەت لەبـەر دائەمالن :

«یا بنی آدم لا یفتننکم الشـیطان کما اخرج ابویکم من الجنة ینـزع عنهما لباسهما لیریهما سوآتهما ٠٠» ٠

بەڵێ بەرنامـە نەفامەکانیش پشتگیریی ئەم کردەوە ناپیاوانە ئەکـەن بە شێوەیەك ئەگەر کۆمەلە موسلمانێك پەردە (حجاب) بەکار بێنن سەرسام ئەمێنن لێیانو چەندەها پیـلانو پروپاگانتەیان بـۆ هەلئەبەستنو بـە کۆنەپەرستی‌یەت ئەکەونە دوایـانو ئەلێن سەرداپۆشـین نەخۆشیی (سیل)ی پێوەیە ، بـۆ ئەوەی زیاتر لێی بتەکێنـەوەو قێزوو بێزی لێ‌بکەن ٠٠ تەنانەت شاعیرانی کـورد زمان بە هۆنراوە قیزەونیـان کـردووە !! وە خەمو پـەژارەی خۆیان نیشـان ئەدەن سەبارەت بـە داماویی‌و دیلکراویی ئافـرەتی کوردزمان ! یەکێ لـەو شاعیرانە (کاردۆخی)یە لە دیوانەکەی خۆیدا «بەشی یـەکەمو هەندێ لە بەشی دووەم چاپی دووەم سالی ١٩٨٢ و لاپەرە (٢٥) لەژێر سەردێری (عەباو پەچەدا) ئەلێت :

---

(١) عەورەتی ئافـرەت لەگەل پیاوی نامەحرەما هەموو لەشـیەتی ، وە لەگەل ژنی موسلمانو پیـاوی مەحرەما بەینی ناوكو ئەژنۆیەتی ٠ لەگـەل ژنی کافریشدا غەیـری ئەو جێگەیـەی دەرنەکەوێ لـە ئیشو کارا هەمـووی عەورەتە ٠ شەریعەتی ئیسلام ، بەرگی یەکەم ، ل٨٥ ٠

ڕەنگو ڕیشەی لەشی زارم ئەڵێی ئێستا لەبن دێنێ

جوانیی شۆخی وا ، حەیفە بە هەوری ڕەش بشارێتۆ
بە گەرمی ناو عەباو چارشێو ، لەشی ناسك بتاوێتۆ

ئەبێ بۆچی وەها دیل بێ ، کچی بەدبەختی کوردستان
بە ڕەشپۆشیو ، بە خەمباریی بژی تا چاڵی گۆڕستان

کە ئەو ناوی (حجابی) برد ، دڵم یەکجاری داگیرا
لە بۆ حاڵیی ژنی کوردی ، کە ماڵی تازە ڕاگیرا

نەبوو وەك ئێستە دیلی ناو عەباو چارشێوی بێمەنفەز
وەیا سەربەستیو بیرو حەقی سووتابێ وەك قەقنەز

بە چارشێو تووشی دەردی (سیل) ئەبێ کچتان ببیسن لێم
بە ژەهری جەهلی ئێوە دارزێ مێشکم هەتا ژێرپێم

ئەگەر ژن خۆی خووی باش بێ ، (سفور) سندوقی پۆلایە
وەگەر مەیلی خراپەی بوو (عەبا) دەستکردی جۆلایە

عەبا بۆچ (ماجینۆ)یەو ، (سەدی ذوالقرنینە) ئەی کوردان ؟
وەیا (شورەی ستالین)و (قەڵای ڕۆما)یە ئەی مەردان

کە خۆی چاکە کچی کوردی ، چە پێویستیی بە عابایە
کچی ڕووپۆشی ناو عەبا وەکو (ورچ) یاخۆ دەعبایە

داخەکەم ٠٠ هەق نەبوو مامۆستا کاردۆخی (سفور) بکات بە سندوقی پۆلا بۆ ئافرەتی کوردزمان بەتایبەت ، چونکە ئادەمیزاد ئەبێ نرخی یاسای باوو نەریتی کۆمەڵەکەی بزانێ ٠٠! واتە نابێ مرۆڤ بێگانە پەرستبێت ٠٠ جلو بەرگی کوردیی جوانترین پۆشاكو ڕەواترین پۆشاکە لەناو هەموو گەلانی جیهانا ، بۆچی ئەبێ فڕێبدرێو (مینیجۆب)و چەشنەکانیتر بخرێتە جێگەی لە کاتێکا هیچ ئیسراحەتو حەوانەوەیەکی تیا نییە ، تەنانەت ئەگەر شتێکی بەکەڵکیشی لێبکەوێ بە سەهلو سووکیی ناتوانێ هەڵیبگرێتەوە!! ٠

کەوابوو با دەستگیریی بێگانە نەبین لە جلو بەرگو ژیانو پێشخستنی وڵاتو خوێندنو خوێنەواریی‌و ٠٠٠٠ هتد ٠

قورئانی پیـرۆز کاتێ فەرمان ئەدات بە لەبەرکردنی پۆشاک لـە سەرەتاوە سەیری یاسای ئابووریی وولات ئەکات نابێ لە سنووری خۆی دەرچێت :

«یا بني آدم خذوا زينتكم عند كل مسجد وكلوا واشربوا ولا تسرفوا ۰۰»

ئەگەر مرۆڤ – بە پێی گریمان – بێغیرەتو بێحەیاو بێشەرم بێتو بە رووتو قووتیی بسووڕێتەوە ۰۰ خۆ بە پێی یاسای ئابووریی ئەبێ شتێك بەکار بێنێ زیان بە خۆیو وولات نەگەیەنێ ۰۰! ۰

بەرنامەی ئیسـلام داوا ئەکات لە مرۆڤ بـە گوێرەی دەسـەلات پۆشاکی جوانو سەرنج ڕاکێشـەر بکاتە بەر ، وە خـۆی بەلاتو هەژار نیشـانی کۆمەڵ نەدات ، چونکە خۆنیشان دان لە پۆشاکی چڵکنو شڕووڕدا ئەبێتە هۆی زویریی خۆیو دۆستانی ۰

پێغەمبەرمان محمد – صلى الله عليه وسلم – چاوی بە پیاوێ کەوت بەرگێکی چڵکنی لەبەرابوو ۰۰ بە تووڕەیەکەوە فەرمووی :

«ئەرێ ئەوە شتێکی دەست ناکەوێ پۆشاکەکەی پێبشۆرێت ۰۰؟! بەوجۆرە بە چڵکنی نەگەڕێت» ۰

وەیا ئەم فەرموودەیترە لە کاتێکا پیاوێکی چاو پێکەوت پۆشاکێکی شڕی لە بەردابوو فەرمووی :

(ئەرێ کابرا تۆ ماڵت هەیە ۰۰؟ وتی بەڵێ هەمە ، فەرمووی لە چ جۆر ۰۰؟ وتی: خوا هەموو جۆرێکی پێداوم۰فەرمووی : دە هەرکات خوا دارایی پێدای ، با لەناو کۆمەڵـدا ببینرێیت ۰۰) واتە بـەو شێوەیە مەسـوڕێرەوە ، ماتـووڵ خوا دەسەڵاتی پێداوی پۆشاکی جوانو تازە لەبەر بکە ۰

بەڵێ ۰۰ هەرچی مایەی زەوقو شەوقە ئیسلام دەرگای بۆ ئاچۆخ کردووە وە ئادەمیزاد هەڵئەنێ بۆ کردنیشی ، سەیری ئـەم فەرموودەیە بکە کاتێ پیاوێ ئەبینێ مووی سەری گرژو هەڵچووە :

«ليس هذا خيرا من أن يأتي احدكم ثائر الرأس كأنه شيطان ٠٠!!!»(١) ٠

پێغەمبەر ـ صلى‌الله عليه وسلم ـ لێی تووڕەبوو ناردی پاكو خاوێنی خۆی كردو رۆنی‌دا لەسەری‌و هاتەوە ٠

ئینجا فەرمووی : «دە ئاوا چاكتر نی‌یە لەوە كە هیواتان هەیە سەری هەڵچووە ئەڵێی جنۆكەیە ؟

ئیسلام ئەڵێت پاكو خاوێن بە ، وە بە ئەندازەی پێویست پۆشاكت ببێ ، بەتایبەت پۆشاكی (موناسەبات) وەك رۆژەكانی هەینی‌و جەژنەكانو هەر موناسەبەتێكی تری كۆمەڵ ٠

سەرت هەموو جار شانە بكەو رۆنی لێدەو پاكو خاوێن خۆت رابگرەو سەیری ئاوێنە بكە بۆ ئەوەی ئەگەر شتێكی قیزەوونت پیانووسابێت لای‌ببەیت ، ئیتر ئەمە كە هەندێ وا تێگەیشتوون كە هەركەسێك پۆشاكەكەی شڕبوو ، یا كراسەكەی چڵكن بوو ، وەیا هەمووكات زوی‌ربوو ئەوە دوسڵمانی تەواوە ، وە زۆر رێكوپێكە لە ئایین‌دا ، بەو مانایە موسڵمان ئەبێ وابێت ٠٠٠!! ئەڵێین ئەوە درۆو پڕوپاڵانتەیە بە دەم ئیسلامەوە هەڵبەستراوە ٠

گەورەو پێشەوامان (شافیعی) خوا لێی رازی بێت ـ چەند جوانی فەرمووە :

حسن ثيابك ما استطعت فانها — زين الرجال بها تعز وتكرم

ودع التخشن في الثياب تواضعا — فالله يعلم ماتسر وتكتم

فجديد ثوبك لا يضرك بعد ان — تخشى الاله وتتقي ما يحرم

ورثيث ثوبك لا يزيدك رفعة — عند الاله وأنت عبد مجرم

---

(١) بطل الابطال ، ل٣٦ ، عبدالرحمن عزام ٠

لەم سەربەستی‌ی جلو بەرگەدا ئیسلام سەرنجی ئەو جیاوازی‌یە سروشتی‌یەی داوە کە لە نێوان پیاوو ئافرەتا هەیە وەك (ئەجوست كومت) - فەیلەسووف‌و هەڵکەوتووی فەرەنسیی - ئەمەی سەلماندووەو بە درێژە باسی کردووە لە کتێبی (النظام السیاسی علی مقتضی الفلسفة الوضعیة)دا بۆیە بەرگی تایبەتیی بۆ دەست نیشان کردووەو جیای کردووەتەوە لە پیاو ‥ وە هەروەها بۆ ئەوەیە رێزو کەرامەتی نەشکێنرێ بە دەست مرۆڤی بێ یاساوە ، وە بۆ ئەوەیە کە گلاو نەکرێ‌و هەستی بریندار نەبێت لەلایەن پیاوی بێ‌ئابرووەوە ‥ لە لایەن ئەوانەوە لە یاسای مرۆڤایەتی‌ی راتەکەن‌و ئەیانەوێ بەسەر شەرەفی ئەم‌و ئەودوە ئارەزووی بۆگەنیان تێر بکەن ، وە بە ناوی (حریەت)ەوە پەردەی ئابروو و غیرەت لەبەر کۆمەڵدا دامالن ، چونکە ئەوانە کۆمەڵێکن وا ئەزانن کە سەربەستیی ئەوەیە : (مرۆڤ هەرچی دەروونی داوای لێ بکات ئەبێ بیکات ، بێ ئەمە هیچ جۆرە یاسایەك بەرگری‌یان بکات ‥ مالی خەڵك تالان بکەن ‥ شەروال پیسیی بکەن ‥ جەردەیی‌و رەشوڕووت بکەن ، کەس دەنگ نەکات بەرامبەریان ، چونکە حورو سەربەستن ‥!! ‥

ئەو جۆرە کەسانە لە چەند ڕوویەکەوە هەڵەو سەر لێ‌شێواون :

١ ـ کەسێك دوای داخوازی‌یەکانی دەروونی‌ی بکەوێ سەربەست نییە ، چونکە هەموو کات دەستگیری دەروونی ئەبێت ‥ وە چۆنی پێخۆش‌بێ بەو جۆرە هەڵی‌ئەسووڕێنێ ‥ خۆ ئاواتو ئارەزووی (نەفس) کۆتایی نایێت ، کەوابوو ئەمیش ئەبێ نۆکەری ئەوبێت ‥!!

٢ ـ ئەمە بانگەوازی بەرەڵلایی‌و راکردنە لە یاسا ‥ واتە لە شوێنی رژێم‌و یاسادا ئاشووبەو بێ‌یاسایی دروست ئەبێت ، خۆ ئەمیش لەگەڵ سروشت‌و یاسای بوونەوەردا ناگونجێت ‥ ئەمە لەلایەکەوە ، لە لایەکی‌ترەوە دژی بیروڕای زاناکانی کۆمەڵایەتیی‌و دەروونناسی‌یە ‥ بەڵکو تەنها پڕ بە دڵی

خۆپەتی‌و ئەو تاقمەیە کە ئەڵێن :

«ژیان تەنیا ئەو چەنـد رۆژەیەکە کە تێـدا ئەژین ، جا لەبەر ئـەوە تا بەرەڵلابین‌و رابوێرین هێشتای هەرکەمە ، چونکە کە مرد تازە نە ئەگەڕێتەوە بۆ ژیان ، وە نە زیندووبوونەوەی پاشەڕۆژی هەیە ۰۰۰۰ !!» ۰

جا ئەوەبوو وتمان لەبەر رێزی ئافرەت‌و بریندار نەبوونی هەستی بەدەست ئەو ئەوەوە ئیسلام بەرگێکی تایبەتی بـۆ دەستنیشان کردووە ، بۆ ئەوەی لە پیاو جیا ببێتەوە ، چونکە هەر وەك لە سروشـتدا جیاوازن ـ بەڵگە بۆ ئەمەیش زۆرە ـ هەر بـەو جۆرەیش ئەبێ لە جلو بەرگدا جیاوازبن ۰۰ تا ئەوانـەی کە ئەیانەوێ لەسەر نامووسی مەردم ئارەزووی پیسیان تێر بکەن دیاریی‌بن ، چونکە ئەگەر پۆشاکیان وەك یەك وابێت ، ئەو کاتە زۆر بە ئاسانیی مەبەستی بۆگەنیان دێتەجێ ، وە لە ئاکامیشدا یاسای بوونەوەر ئەشـلەژێ ، وەك سەدەی بیستەمی لێ‌ئەقەومێت ۰۰!!

ئەو بەرگەی ئیسـلام دەست نیشـانی کـردووە بـۆ ئافرەت بـەم جۆرەی خوارەوەیە :

یەکەم : پان‌و پۆڕبێت لە بەریا ، بەشێوەیەك ئەندامەکانی دیاریی نەکات، واتە تەنگ‌و تەسك نەبێت لە لەشیاو (واقع)ی لاشەی دەرنەخات ۰

دووەم : تەنك‌و ناسك نەبێت بە شێوەیەك ئەوی لەژێریا بێت ببینرێت ۰ چونکە هەڕەشـەی سامناك هەیە لە لایەن پێغەمبەرەوە ـ صلى الله عليـه وسلم ـ سەبارەت بەو ئافرەتانەی پۆشاکی ناسك ئەکەنە بەریان‌و لە پێش‌چاو مەردمدا ئەسوورێنەوە ، خۆ ئەگەر (سفور)بن ـ پەنا بەخوا ـ ئەوە ئیتر سزای ئەوانە بە دەم باس ناکرێ :

«ونساء كاسيات ، عاريات ، مائلات مميلات ، رؤسهن كاسنمة البخت المائلة لا يدخلن الجنة ولا يجدن ريحها ، وان ريحها ليوجد من مسيرة كذا وكذا ۰۰»(۱)

---

(۱) موسلم گێڕاویەتەوە ۰

قورئانی پیرۆزیش ئەفەرموێ :

«یا أیها النبي قل لازواجك وبناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن ، ذلك ادنى ان يعرفن فلا يؤذين وكان الله غفورا رحيما ..»(١) .

ئافرەتە خاوەن بڕواکان لەو سەردەمەدا پۆشاکێکیان ئەکردە بەر وەك بەرگی ئەو کەنیزەکانە وابوو کە خووڕەوشتیان ناپەسەند بوو ..!! وە بە دوای شەروال پیسیدا نەگەڕان ، ئەو بەرگەیش بریتیبوو لەکراسێکی شۆڕو ڕەشتەیەك زۆر جاران چمکێکی شۆڕ ئەبووەوە بە دوایاندا .. وە دوگمەی کراسەکەیان دانەئەخست بۆ ئەوەی گەردنو سنگیان دەرکەوێ بۆ چاوچنۆکەکان !! ئینجا قورئان هاتو دەستنیشانی هەڵەکەیانی کردو فەرمووی :

«نابێ ئافرەتی ڕەوشت پاك وەك ئافرەتی بەدخوو و بێڕەوشت وابێ .. واتە هەروەك لە ڕەوشتا پاكو خاوێنو بێگەردە هەروایش ئەبێ شتێك بەکار نەهێنێ ببێتە هۆی شکاندنی کەرامەتو ڕێزی ناو کۆمەڵی موسڵمانان ..»(٢) .

ئەی خوشکی بەڕێز :

ئاگات لەخۆت بێو هەڵنەخەڵەتێیت بەو واتو وێتەیەی دوژمنانی خواو پێغەمبەر - صلى الله عليه وسلم - ئەیکەن لەسەر ڕۆژنامەکانو گۆڤارەکاندا ، چونکە ئەیانەوێ بە ناوی ئازاد کردنو سەربەستیی تۆوە - گوایا ئایینی ئیسلام سەربەستیی پێنەداویت - ئاواتو ئارەزوواتی بۆگەنو ژەهراوییان بچەسپێنن ئینجا دوای ئەوە کە هەستیی برینداار کردیت - خوا نەخواستە - وەیا دوای ئەوە پلار هاتە سەرت .. ئەوان لە ڕێوی فێڵبازترن ، وە هەزارەها فێڵو تەڵەکە ئەسازێنن بۆ ئەوەی ئەو پلارە لە خۆیان دوور بخەنەوەو توندی گەردنی تۆی بکەن ..!!

---

(١) سوورەی الاحزاب/٥٩ .

(٢) اسلامنا ، ل٢٢٨-٢٢٩ .

ئەی خوشکی

ئەی خوشکی بەشەرەف :

دوای فات‌وفیتی ناپاکان نەکەویت‌و هەڵنەخەڵەتییت ۰۰! چونکە ئیسلام تۆی بەرێزی بە نیوەی کۆمەڵ داناوە ، بە خانم‌و سالاری ناو ماڵ ۰۰۰ بە قوتابخانەو یەکەم پەروەردەکەری منالّ ۰۰۰ بەرگی رێزو ئابروو کەرامەتی کردووەتە بەرت ۰۰ لەگەڵ پیاودا هاوژیانن وەك یەك لە هەردوو جیهانا ــ بێجگە لە چەند شتێك ــ کە زانیاریی سەدەی بیستەمیش سەلماندوویەتی کە جیاوازی‌یان هەیە لەگەڵ پیاودا ۰ بۆ نموونە بەرێز ماموستا (فەرید وجدی) لە کتێبی (دائرة المعارف الکبری الفرنسية)دا ئەڵێت :

«دڵ کە مەڵبەندی ژیانە ، بە پێی لێکۆڵینەوە روون بووەتەوە کە دڵی ئافرەت لە ٦۰٪ گرامی لە دڵی پیاو بچووکترە ، وە توانای بەرگریی کەمترە ۰۰! وە هەروەها کۆئەندامی هەناسەدان لای پیاو بەهێزترە لە کۆئەندامی هەناسەدانی ئافرەت ۰۰! هەر ئەم جیاوازی‌یە سروشتی‌یەیە کە پیاو لەیەك کاتژمێرا ١١٪ی کاربۆن سەرف ئەکات ۰۰ کەچی ئافرەت لە ٦٪ی‌و کەرتێك سەرف ئەکات ۰۰ ئەمە بوو بەهۆی ئەوە کە توانای ئافرەت کەمتر بێت لە توانای پیاو ۰ ئەمە لەم بارەوە ، ئینجا لە رووی پێنج هەست پێکەرەکانیشەوە (حواس الخمس) ماموستا (نیکۆلس)و ماموستا (پۆلیە) ئەڵێن :

هەست‌کەری ئافرەت گەلێك لاوازو بێ‌هێزە لەچاو هیی پیاودا ، بۆ نموونە : ئافرەت ناتوانێ زۆر لە دوورەوە ــ مەبەست ئەو ماوەیە کە زانیاریی دیاری کردووە ــ بۆنی شت وەرگرێ ۰ وە هەروەها سەلمێنراوە کە مێشکیشی بچووکترە لە مێشکی پیاو بە رێژەی (۱۰۰) گرامی ناوەندیی ۰

وە لەسەر باسەکەیان ئەڕۆن‌و ئەڵێن «قارینی» وتوویەتی ئافرەت بەرگەی تەنگانە ناگرێ ۰۰ چونکە زۆر زوو تێك‌ئەچێ‌و ئەشڵەژێ ۰ وە فەیلەسووف‌و دەنگەوتوو «پرۆدۆن» ئەڵێت :

ویژدانی ئافرەت کەمترو لاوازترە لە چاو هی پیاودا ٠٠ وە هەروەها تەبیعەتو سروشتی ئافرەت لەگەڵ هەندێ شتدا یەك ئەگرێو ئەگونجێت ، کەچی هی پیاو ناگونجێت ٠٠(١) ٠

دکتۆر (الکسیس کاریل)یش لە کتێبی (الانسان ذلك المجهول)دا کە باسی سروشتو ئیشوکاری ژنان ئەکات لە لاپەرە ١٠٨ـ١٠٩دا ئەڵێت :

«ئەو جیاوازییەی لە نێوانی پیاوو ئافرەتدا هەیە ، وە نابێ تەنها لە وێنەی تایبەتی ئەندامی زاوزێوە بێ ، یا لە بوونی منداڵدانو سکپڕیەوە بێ ٠٠ یا لە شێوەی پێخوێندنو فێرکردنەوەبێ ٠٠ چونکە ئەوە خاوەنی سروشتێکی گرنگترە لەوە ٠٠٠٠ ئەو جیاوازییەیان ئەبێ لە پێکهاتنی تیشووەکان (تکوین الانسجة) خۆیان ، وە لە چاککردن (تلقیح)ی لاشە ٠

نەشارەزایی لەم ڕاستییانە بوو پاڵی نا بەو کەسانەوە کە بەرگریی ئافرەتان ئەکەن بۆ باوەڕهێنان کە : ئەبێ پیاوو ئافرەت یەکجۆرە خوێندنو فێرکردنو پەروەردەیان ببێ ، وە یەکجۆر ئەرکیان بدرێ بە شانا ، ئەوەی ڕاستیی بێ ئافرەت جیاوازیی گەورەی هەیە لە پیاو ، وە هەر سێلێك لە خانەکانی لاشەی سروشتیی نەژادیی خۆی هەیە ٠٠٠

کەوابوو ئەمەی کە زۆر جاران لە گۆڤارەکاندا ئەنووسرێتو ئەڵێت :

ئەبێ پیاوو ئافرەت یەکسان بن لە ئیشو کارو ئەرکدا ٠٠ !! ٠

یا ئەڵێن هەموو پیاوێك لەشی بەشێك (هۆرمۆن)ی ژنانەی تێدایە ، هەر وەك ئافرەتیش بەشێك (هۆرمۆن)ی پیاوانەی تێدایە ٠

---

(١) الاسلام والمرأة للعلامة جعفر النقدی (قده) ، ل٤٢ـ٤٣ ٠

وەیا هەنــدێ دوژمن بە زانستو زانیــاریی ئافرەتێك بەکرێ ئەگــرێ بۆ ئەوەی بلاوی بکاتــەوە بڵێت : «من خۆم کە ئافرەتم بە هەموو ئامێرێــك خەریك بووم لە تاقیگەکاندا بۆ دۆزینەوەی جیــاوازیی نێوان پیاوو ئافرەت سەرئەنجام زانیاریی سەلماندی کە : «لە هیچ شتێکدا ئافرەتو پیاو جیاوازییان نییە ••!!»

یا ئەڵێنو ••• ئەڵێــنو ••• ئەڵێــن •• دەرکەوت لە وتــەی ئــەم زانــا بەرزانەوە ــ کە ئەمانیش بێزانیاریی بڕیار نادەن ــ کە ئەم واتو ویتەیە زۆر دوورە لە ڕاستییەوەو زانیاریی پشتگیریی ناکات ، وە ئاواتیان تەنها ئەوەیە لەم چاوو ڕاوەدا کە خوشکە بەڕێزەکان فریب بدەنو ڕێگەی ڕاستییان لێ چەواشە بکەن •

خوشکو برای بەڕێز :

ئەمە کورتەیەکی ڕای ئیسلامو ڕای ئەو زانا بەرزانە بوو کە لە حەقیقەتی زانیاریی تێگەیشتوون ، ئینجا ئێوەیش خۆتانو ویژدانتان •



# ڕۆژی ڕەشی ئافـــرەت

هەندێکەس هەیـە دڵی ڕەشی بووە بـە قەقنەز بۆ ئافرەت بێ بێبەختیی‌و چارەڕەشی ‥ ! دە چی‌یە چارە ڕەشی‌یەکەی ‥ ؟ چونکە ئیسلام عەباو پەچەی بۆ داناوەو ناهێڵێ بە ئارەزووی ئەو لەگەڵیا ڕابوێرێ‌و ئەم‌شارو ئەوشار لەگەڵیا بسووڕێتەوە ، لە قوتابخانەکاندا لەسەر یەك کورسی دانیشن ، لە بازاڕدا قۆڵ بکا بە قۆڵیا ‥ هەر شوێنێ ئارەزوویان بوو بۆی بڕۆن ، وە لە هەموو دەزگاکاندا هاوبەشبن ‥‥ !!

بەڵێ ‥ لە هەموو شوێنێکا میکرۆب هەیە ، لەگەڵ ئەو هەموو کۆششەدا دەزگا دروستی‌یەکان ئەیکەن ، وە لەوانەشە (میکرۆبە)کان یاسای تەندروستیی بە یاسایەکی ستەمکارو ناپەسەند دابنێن ! چونکە ژیان لەوان تێکچووە ، دە خۆ ئەگەر دەستیشیان بۆ نەبرێت بەجارێ ئادەمیزاد قەلاچۆ ئەکەن !!

دە خوشکی بەڕێـز : ئاگاداربەو بزانە عەباو پەچـەو خانمێتی ناو ماڵت‌و دوور کەوتنەوەت لەبەر دەست چاوچنۆکانا ڕۆژی ڕەش نیيە بۆ تۆ ، ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : گلـۆپی ڕاستی‌یان لێکوژاندوویتـەوەو کەوتوویتە ناو چەنـدان چاڵ‌و چۆڵی‌یەوە ، بۆ ئەوەی میکرۆبەکان مەبەستی ژەهراوی‌یان جێبەجێ بکەن ٠

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە کە چەندەها یانەی خۆجوانکردن‌و قژ کورت کردنەوەو بۆیەی کوڵم‌و لێویـان بۆ داهێنـاوی ، گوایا تۆی ــ چـارە ڕەش ــ بێبـەشی لە جوانیی بەڵکو بە بۆیەو شتی‌وا تۆزی ڕەونەق پەیدا بکەیت !!

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : بەرەو سینەماو تیاترۆ خانەکان مل ئەنەیت !

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : لەگەڵ پیاودا بە ڕووتی (مەلە) بکەیت ‥!

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : بە ڕووتی بە شەقامەکاندا ئەتگێڕن ‥!

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : کراوی بە وەرزی‌یەروو هەموو ئیشێکی فورست پێ

بکەن ..!

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : کە یانەی ڕووتیی (نادی العراة)یان بۆ داهێناوی بۆ ئەوەی لەگەڵ دەموو پیاوێکدا بە ڕووتیی ڕابوێری !!

ڕۆژی ڕەش ئەوەیـە کە : ئەفەریقا ئەیکـرد پێت ، شەوی بـووکێنیت ئەو خزم‌و هاوڕێیانەی زاوا بانگ ئەکران بۆ سەر ئاهەنگەکە ، بەر لە زاوا یەك لە دوای یەکدا بە بووك دەگەیشتن ..!!

ڕۆژی ڕەش ئەوەبـوو کە : ئەوروپا ئەیوت ، مێرد دەتوانێت لـە هاوسەری بدات‌و بریندار بـکات ، بۆی هەیە سـەرتاپا دایتلیشێنێت‌و پێی لـە خوێنیدا بگەوزێنێت . ئەو پیاوە گوناهی ناگات گەر ئاه لە ژنەکەیدا مابوو برینەکەی بۆ بدوورێتەوە ..(١) .

ڕۆژی ڕەش ئەوەبـوو : توانییان لە (پاریس)دا بە ڕووت‌و قـووتیی‌و بەبێ هیچ جۆرە بـەرگێ بتسوورێننەوە بە شەقامەکاندا .. گۆڤـارو ڕۆژنامەکانیش ئەمەیان بـە بلیمەتیی‌و پاڵەوانیی داناو بە شانازیی‌یەوە بڵاویـان کردەوە .. !! چونکە بە ئاواتی خۆیان گەیشتن .

ڕۆژی ڕەش ئەوەیـە : بەیانی زوو لە مـاڵ دەرئەچیت‌و تـووشی چەندەها گیروگرفت ئەبیت لە ڕێگەوبانا بۆ ئەوەی پارووێ نان بە دەست بێنی .

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : وەزیفەی دایکی‌یەتت لە دەست داوە ..! وە کۆرپەو جگەر گۆشەکەت ئەدەیتـە دەست ئافرەتێکی نەناسراودوە !! بـەڵێ .. کافران لە داب‌و نەریتی خـاوێنی لایانـدابن بە هەر شـێوەیەك بۆی کـرابێ ، ڕۆژنامەی (الاهرام)ی قاهیری بڵاوی کردەوە لە ژێر سەر دێری (مع المرأة)دا کە :

«بەم زوانە بـۆ یەکەمجار پەیمانگەیـەك ئەکرێتەوە سەبارەت بـە کورت کردنەوەی قژی ئافرەت لە شاری (ئەسـکەندەری)یەدا ، وە پسپۆڕێکی ئەڵمانی

---

(١) ئافرەت لە مێژوودا ، ل١٤ ، دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد ١٩٨١ .

چاودێری ئەم کارە ئـەکات ..»(١) ئینجا ئەوانەیش کە بەکرێگیـراوی بێگانە بوون لەسەر دەزگاکان لـە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانـدا ئەم جارەیان بـڵاوکردەوە بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاسـتدا ـ چونـکە ئەمـان لەچاو ئەواندا لـە ڕەوشتا هێشتای دانەبەزیبوون ویسـتیان لە خۆیان خراپتریـان پێبکەن ـ بەڵێ ئەمـانیش وەك کەسێکی زۆر تینوو بە گورجیی ڕۆیشتن بە سەر دەم بانگەوازەکەیەوەو کۆشیان بۆ گرتەوە (چونکە پێشنیاری بێگانەیە ..!!) .

ڕۆژنامەی (جمهوری)ی قاهیـریی ژمارەی ڕۆژی شەممە ڕێـکەوتی (٩)ی یۆنیۆی ساڵی ١٩٦٢ی زایینی بڵاوی کردەوە لەژێـر سەر دێری ڕۆژنامەنووسێکی ئەمەریکیی ئەڵێت : «خۆتان دوور ڕابگرن لە تێکەڵاویی ، وە جڵەوی بەرەڵڵایی ئافرەت بگرنەوە ..» واتـە ئەوەی پێی ئەڵێـن سەربەستیی ئافرەت بـە مانای ڕووتوقووتیی ئەوە سەربەستیی نییە !! .

وە هەروەها هێلسان سـتانسبری ـ ڕۆژنامـەنووسی ئەمەریـکیی ئەڵێت : «کۆمەڵی عەرەب ، کۆمـەڵێکی ڕێکوپێکە ، وە زۆر جێگەی خۆیـەتی ئەم کۆمەڵە بمێنێتەوە لەسەر ئەو یاسایەی کە ئافرەتو لاو ڕائەگرێ لە سنووری ژێرییدا ، وە ئەم کۆمەڵە زۆر جیاوازیی هەیە لەگەڵ گەلانی ئەورووپاو ئەمەریکادا ..» .

وە ئەو ئافرەتە ڕۆژنامە نووسە ـ هێلسـان ـ لەسەر یاسەکەی ئەڕواتو ئەڵێت : «ئێوە ـ موسڵمانـەکان ـ یاسایەکی بەنرخی واتان هەیـە کە پێویست ئەکاتە سەر مرۆڤ ڕاگیرکردنی ئافرەت لە پلـەی غیرەتو شەرەفدا ، وە ڕێزی باوكو دایك دیـاریی ئەکات ، وە بەرەڵـڵاییو بێ پەردەیی یاساغ ئـەکات ، کە ئەمانە ئەمرۆ ڕیشـەکەنی کۆمەڵو خێزانی ئەورووپاو ئەمەریکایان کردووە ..!!.

---

(١) فقه السنة ، بەرگی دووەم ، ل٢١٤ .

وه هەروەها ئەو یاسایەی کۆمەڵگای عەرەبی ـ واته ئیسلامی ـ هەیەتی سەبارەت به کچه بچکۆلەکان ـ مەبەستم ئەوانەیه خوارترن لە بیست ساڵ ـ زۆر بەکەڵك‌و سوود بەخشه بۆ خۆیان‌و بۆ کۆمەڵ • ئینجا منیش ئەڵێم : «باوو نەریتتان توند بگرن ، بۆ ئەوەی خۆرئاوا لێتانی نەشارێتەوه •••!! هاوار •• هاوار له تێکەڵاویی کچ‌و کوڕ •••!! وه له ڕووی دۆستایەتیی‌و ڕاستییەوه ئەڵێم پێتان : بگەڕێنەوه بۆ چەرخی پەرده (حجاب) چونکه ئەمه زۆر زۆر باشتره بۆتان له بەرەڵڵاییەکەی ئەورووپا •••!» •

کچ‌و کوڕ دوور بخەنەوه له یەك ، چونکه ئێمه له ئەمەریکا گیرۆدەی بەرەڵڵایی‌و بێ‌پەردەیین» •

وه هەروەها هێلسان ئەڵێت : «ئەو بەرەڵڵاییەی ئێمه ـ خۆرئاوا ـ داوامانه به ئافرەت بوو بەهۆی پەیدابوونی شەقاوەی شەقامەکان‌و ڕێگاکان •• سەیرتر ئەوەیه که : ئافرەت له پێش چاوی خزم‌و کەس‌و کاریدا به ئارەزووی خۆی ڕاڕەبوێرێ •• واته بێ ئەوەی یاسایەکی شەرعیی بەکار بهێنرێت له نێوانیاندا •• !!» •

خۆ ئەگەر کەسێك غیرەت‌و شەرەف پاڵی پێوه بنێت‌و بڵێت :

«ئەم بەرەڵڵاییەتان له چییه •••؟! ئەڵێن سەدەی بیستەمه ، سەدەی ئازادی‌و سەربەستییه •• لەسەری بڕۆیت پۆلیست بۆ بانگ ئەکەم ! ئەو سەربەستیی (بەرەڵڵایی)یه وا تینی تێکردووین لەیەك کاتژمێردا ئافرەتان سێ چوار شوو ئەکەن‌و تەڵاق وەرئەگرن بێ‌ئەوەی هەست به لەکەو نەنگ بکەن ••»(١) •

---

(١) فقه السنة ، بەرگی دووەم ، ل٢١٧ـ٢١٩ ، بۆیه ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش له هەندێ کاتا تەنها پیاو به خاوەن هەق دائەنێ له تەڵاقا •• بەڵام بڕێ کات پیاو پێی خۆش‌بێ یا نەو ، ئافرەت لای قازیی تەڵاق وەرئەگرێ •
←

وه له کتێبی (كلمات مضيئة مهداة الى المراة) بەرگی یەکەمو لاپەڕە (٥٤ـ ٥٨)دا هاتووه ٠

(لامپرت) له لاپەڕەی (نیویورك هیرالدتریبون)دا ئەڵێت : «ئەو منالانەی له (لەندەن) له دایك ئەبن له ٧ر١٢٪ی به شێوەی بێشەرعیی‌و بەرەڵلاییە ، واته بێ‌ئەوەی یاسایەك پێش‌چاو بگیرێ بۆ ژن‌و مێردیی» ٠

ڕاپۆرتێکی ســالانەی وەزارەتی ناوخۆی ئینگلیز ئەڵێت : «ژمــارەی ئەو ئافرەتانــەی کــه خراونــەته بەندیخانــەوه لــه بەریتانیــادا ـ بەهــۆی دزیی‌و جەردەیی‌یەوه ـ ژمارەیان گەیشتووەته (٧٤٢٠٠٠) هەزار ئافرەت ٠ وه هەروەها ئەڵێت : (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار بەند کراون لەسەر شەرواڵ پیسی‌ی ٠

وه لەســەر ژمێریی ســالی ١٩٦٦دا ئەڵێت : ئــەوانەی هێشــتای مێردیان نەکردووەو تەمەنیــان له (١٥) پانــزه سال زیاتــره ، تەنها ١/٥یــان کچێنیان ماوه ٠ وه بــۆ سالی ١٩٦٧ زانا کۆمەڵایەتی‌یەکان مەترسی‌ی ئەوه ئــەکەن که به تەواویی کچێنی نەمێنێ له (ئینگلتەره)دا !! ٠

بێ‌ئابڕوویی‌و بێ‌شەرەفیی لەم هەنگاوەدا نەوەستاوه ، بەڵکو گەیشتە ئەوه که ڕۆژنامەی (نیوزدی‌ورلد)ی ژمارەی ڕێــکەوتی ١٠ی مایۆی ١٩٦٤ بڵێت : له شاری (ســاکرامینتۆ) پایتــەختی کالیفورنیــا پــۆلیس یانەیــەکی ئــاڵوگۆڕی ئافرەتانی دۆزی‌یەوه ٠٠!» واته بــەرەڵلایی گەییشته ئەو ڕادەیە کێ حەز ئەکات به ژن گۆڕینەوه سەربەسته ٠٠!! ٠

---

واته ئەگەر پیــاوەکه هۆیەکی تێدابوو بەرگری ژن‌و مێردی نەکــرد ئەوه ئافرەتەکه بۆی ڕەوایه جیا ببێتەوه له مێردەکەی وەك :

یەکەم : شێتی‌ی ٠ دووەم : گولی ٠ سێهەم : بەڵەك‌بوون ، چوارەم : هێنەکەی کابرا ئەوەنده گەورەبوو ژنــەکه پێی هەڵنەئەگیرا ٠ پێنجەم : شله پەتکەیی ئالەتی‌ی ٠ شەشەم : ئالەتی‌ی بڕابێ ، حەوتەم : مێردەکەی لات‌بێ‌و نەتوانێ مــارەیەکەی بــدات ٠ هەشتەم : مێــردەکەی دەسەڵاتی‌ی نەفەقەی نەبێ بیداتێ ٠

ئەو کردەوە ناپەسەندانەن ڕۆژی ڕەشی ئافرەت .. نە پەردە ، نە شەرمف ، نە خانمێتی ماڵ ..

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : کە لە وڵاتی (هندستان)دا هەروەك کەنیزەك فرۆشرایت . وە ئەوەندە بە سووکو بێنرخ تەماشا کرایت زۆرجار لە قومارا ئەیاندۆڕانیت ! ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : هەندێ کات تەنها ئافرەتێك چەندەها مێردی هەبوو !!

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : کاتێ مێردەکەی بمردایە ، ئەبوایە خزمەتی خزمو کەسوکاری مێردە مردووەکەی بکردایە ، تا دوا هەناسەی .

ڕۆژی ڕەش ئەوەبوو : نیشانەی دڵسۆزیی ئافرەت بۆ مێردە مردووەکەی خۆسووتاندنی بوو .

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە : ئێستا تێیکەوتووی ، چونکە بە ناوی ئەوەوە کە سەبارەت بە ئابووریی ئازادیی هەوڵو کۆشش بدە ، خۆت ماندوو بکە ١٠ـ١٢ کاتژمێر ئیش بکە ، ئینجا هەموویشت پێسەرف ئەکەنەوە لە خۆتا ، لە مۆدێلدا .. لە خۆجوانکردندا .. لە قژ کورتکردنەوەدا .. لە مینیجۆبدا .. هێشتای سەرەڕای ئەوە مەردم سەدان پلارو توانجتان تێئەگرن .

ڕاپۆرتێکی ئینگلیزیی ئەڵێت : ساڵی ١٩٦٤ ئافرەتانی بەریتانیا (٩٠) ملیۆن (جنیهی ئیسترلینی)یان خەرجکرد بۆ کڕینی ئامێری خۆ جوانکردن . وە هەروەها ئەڵێت (٢٠٠) ملیۆن (جنیە)یان سەرف کرد سەبارەت بە قژداهێنانو لوولکردنیو کورتکردنەوەیو هەروەها ..!!(١) .

ئەی هاوار بۆ تۆ .. بۆچی (سیادەتی) خۆتت لەکیسدا ..؟! ئەوە تەنها لە مەسەلەی قژدا بوو ئەوەندەیان پێ سەرف کردویت .. ئاخۆ بۆ جلو بەرگو

---

(١) المراة في ظل الحضارة الغربية ، ل٨ .

بێنخۆشیی و عەرەق و ئەو شتانەی تر کە ئێستا باون چەندیان پێ سەرف کردبیت ..؟!! . هەموویشی لەبەر ڕەزامەندیی چەند کەسێکە ، ئەو کەسانەیش بە هیچ جۆر لێتان ڕازیی نابن .

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە کە : ئەوانەی فابریقەی ئۆتۆمۆبیلیان بەدەستە ، وە هەرکاتەی مۆدیلێك نیشان ئەدەن بە جیهاندا ، ڕۆژی کردنەوەی (پیشانگا)کەیان چەند کچۆڵەیەکی نەرمونیان و ڕووت و قووت ئەهێنن لە پیشانگاکەدا ئامادەیان ئەکەن بۆ ئەوەی خەڵکی زیاتر ڕوویان تێبکات بۆ کڕینی ئۆتۆمۆبیل ..

ڕۆژی ڕەش ئەوەیە کە ئەڵێن : لە (بودابست)دا یەکێ لە یانە گەورەکانی قومارکردن دایهێناوە کە ئەوانەی قومار ئەکەن و سەرکەوتو ئەبن لە باتی (پسووڵەی پارە) کە لەوێ باوە ـ چەند ئافرەتێکی لاو وەرئەگرن !! ئەمیش ئەوەیە قومارخانەکەی برەوی زیاتر بێت ..!! .

وە هەروەها لە هەندێ لە (چێشتخانەکانیشدا) ئەم شێوازە بەکار ئەهێنرێ !!

دەی ئایا ـ خوشکی بەڕێز ـ ئەم جۆرە کردەوانە لەبەر خاتری چاوی کاڵی تۆیە ..؟ یا سەرنجی مەردم ڕائەکێشێ و برەوی کارگەکەی زیاتر ئەکات ؟

خوشکی بەڕێز :ـ

دە ئەمجارەیش ڕاپەڕەو بیکە بە گاڵەو ئەو ڕەوشتە ناپەسەندانەی کە بەکرێگیراوەکان بوون بە هەڵگرو حەماڵی ، وە بە هەموو شوێنێکا ئەیگێڕن و بڵاوی ئەکەنەوە .. لێیان مەکرەو بیخەرە ژێر پێتەوە بە یارمەتی خوای گەورە . چونکە ڕەوشتێك ئەوەندە بۆگەن بێت حەماڵەکانی هاوار بکەن و بڵێن : ئاگات لە خۆت بێ .. لێمان نەکرێت بۆ ئەوەی وەك ئێمەتان لێ نەقەومێت ..! تۆ و خوا ئەو ڕەوشتە بە کەڵکی ئەوە دێت وەری گریت ؟! .

# چەند رەخنەیەك لە ئیسلام سەبارەت بە ئافرەت !

**خوشکی بەشەرمقم :ــ**

دوژمنەکانی خواو پێغەمبەر ــ صلی‌الله علیه وسلم ــ بە هەموو جۆر هەوڵو تەقالا ئەدەن بۆ ئەوەی ئیسلامت لەپێش‌چاو بخەن ، ئینجا بە تەواویی خۆتی بۆ شل‌بکەی ، بێ‌ئەوەی بیری پاشەڕۆژو لێ‌پرسینەوەت لا بمێنێ ــ خـوا پەنامان بدات ــ ئەمەیش بە چاوی دوژمنایەتی‌یەوە تەماشای قورئان ئەکەن ، ئینجا هەر ئایەتێك پەیوەنـدیی بە تـۆوە ببێ ، ئەوان بـە رەش کوێـریی‌و بێ‌ئەمـەی ئە ماناو مەبەستەکەی بـگەن ئەیهێننو بـە سەتحی‌یانـە ئاراسـتەت ئەکەن .. !!

ئاشکرایە تۆی بەرێزیش شارەزای قورئان نیت ــ داخەکەم ــ تا خۆت دەمکوتیان کەیت‌و هەقی ئەوەڵو ئاخریان لێ‌بسێنی ــ لەبەرئەوە کە تۆ بەنرخو بە بەهای لای ئیسـلام ، وا من پشت بەخوا هەندێ لەو ئایەتانەت بۆ رۆشـن ئەکەمەوە ، ئیتر بەشکوم خۆیشت ئەگەر رەخنەیەکی تریان خستە پێش‌چاوت لەبەر رۆشنایی ئەمانەدا شیبیان بکەیتەوە :

١ ــ سوورەی (الاحزاب)و ئایەتی ٣٣ دەفەرموێ :

«وقرن في بيوتكن ولا تبـرجن تبرج الجاهلية الاولى واقمن الصـلواة وءاتين الزكوة واطعن الله ورسوله ...» .

ئەم چاو چنۆکانە وا ئەیخەنە پێش‌چاو خەڵکی کە ئیسلام ئەڵێت : ئەبێ هەر لە ماڵەوە دانیشـیت‌و دەرگای ژوورەکەت لـە خۆت قایم‌کەیت‌و سـەر نەهێنیتە رۆشنایی وەك ئەوە دەس بەسەر بیت ، وەیا شتێکی زۆر ناپەسەندت کردبێت لە ژێر سایەی گەردوونـدا ..!! کەوابوو ــ بە پێی وتەی ئـەوان ــ خوێندەواریی چی‌و ..؟ پزیشکایـەتیی چی‌و ...؟ بـرین پێـچی چی‌و ..؟ دەرز ووتنەوەی چی ..؟ وە هەروەها ئەو ئەرکانەی‌تر کە ئافرەت تیایدا وەك پیاو وایە ، ئەبێ بفەبن لێت .. چونکە ئافرەتیت !! چارەت رەشە !! .

بەڵێ ‎٠٠‏ ئـا بەو جـۆرە زوربەی خوشـكان فریودران ، وایـانزانی ئەو گورگەی كە لە «پێسـتی مەڕدایە !» ڕاست ئەكات كە ئەڵێت : ئیسـلام یاساغی كردووە بخوێنێت لە بەشی ئامادەیی‌و زانكۆدا ‎٠٠‏ وەیا ببێت بە وانەبێژ (مدرسە)و پزیشك ‎٠‏

بەڵێ ‎٠٠‏ وای ئەخەنـە پێش‌چاو خەڵـكی ‎٠٠‏ بەڵام ئیسلام لەبـەر گرنگی‌و بایەخدان بە شانی تۆ وای بڕیارداوە كە مرۆڤی چاوچنۆكت ، وە هەروەها داوێن پیس‌و دەست پیست لێ دووربخـاتەوە ، تا وەزەنت لێ نەكاو هـەستت بریندار بكات ، ئەم پارێزمشت بەم شێوەیەیە :ـ

یەكەم : لە قوتابخانەی جیاوازدا بخوێنێت ‎٠‏

دووەم : ئافرەت دەرزت پێ‌بلێت ‎٠‏

سێهەم : بە شێوەی شەرعی خۆت داپۆشیت ‎٠‏

چوارەم : ئـەگەر پزیشكیت ، وەیا برین‌پێچ لە نەخۆشـخانەی ئافرەتانا كاتی خۆت بەسەر بەریت ‎٠‏ واتە ئافرەت بۆ ئافرەت‌و پیاو بۆ پیاو ، سا مەگەر دكتۆری ئافرەت نەبێت ، یا ببێت ، بەڵام شارەزای ئەو نەخۆشی‌یە نەبێت ئەوە لەم كاتەدا ڕەوایە بڕۆینە لای دكتۆرێكی پیاو فەحست بكات تا نەخۆشی‌یەكەت دەست نیشان بكات‌و چارەسەرت بۆ بكات ‎٠‏

دێینەوە سەر باسی ئایەتە پیرۆزەكە ، خوێنەری بەڕێز :

كاتێ خوا ـ جل‌جلالە ـ ئەفەرموێ :

«وقرن في بيوتكن ‎٠٠‏»

بەس ئەم ڕسـتەیە نییە مەسەلەكە ‎٠‏ واتە سەربەست بێت‌و پەیـوەندی بە هیچی‌ترەوە نـەبێ ‎٠٠‏ تـا ئەم ڕەخنـەیە جێـگای خۆی بكاتـەوە ‎٠٠‏! بەڵكو پەیوەستە لە مانادا بەو ڕستەیەوە لەدوایەوە دێت :

«ولا تبرجن تبرج الجاهلية الأولى» ‎٠‏

ئینجا ماناکەی ئاوایە :

«جێگەی ڕاستەقینەتان ماڵەوەیە ، دەی لە ماڵەوە جێگیربن ، وە خۆتان دەرمەخەن (سنگ‌و گەردن‌و قاچ‌وقولتاو) وەك سەردەمی نەفامیی • واتە ئەوان لە ماڵەوە دەرئەچوون‌و خۆیشیان دەرئەخست ، دەی ئێوە وامەبن ، چونکە نیشتگەی ڕاستیی‌تان ماڵەوەیە ، جا ئەگەر هەر دەرچوون خۆتان دەرمەخەن •

کاکڵەی ماناکەی ئەمەیە :

کارو پیشەی ڕاستەقینەی ئافرەت ناوماڵە ، وەك دایکییەتی‌و خانەییەتی ناوماڵ‌و چاودێریکردنی ئەو منالانەی کە پاشەڕۆژمان بە هیوای ئەوانە ، ئینجا بەرامبەر بەوە کە لەماڵەوە بێت‌و دەرنەچێت ، ئایینی پیرۆزی ئیسلام تفاق‌و ڕۆزی هەمەچەشنەی پێویست کردووەتە سەر باوك‌و براو خزم‌و کەس‌وکاری پێش ئەوەی شوو بکات ، وە لەسەر مێردی دوای شووکردن ، با ئافرەتەکە زۆریش دەوڵەمەند بێت ••!!

ئەگەر ئەم یاسای ژن‌و مێردییە تێکچوو ، واتە ئافرەتیش وەك پیاو هەوڵی وەزیفەی داو ئیشە تایبەتی‌یەکەی خۆی خستە پشتگوێ ، ئەوە چەندەها گیرو گرفت‌و گرێکوێرە دێتە بەردەم ژیانی هەردوولایان وەك :

- ئاژاوەو ئاشووبە پەل دائەکوتێ بەسەر هەردوولادا •
- منال سەری لێ‌تێك ئەچێ •
- ئافرەت هەمووکات لە ئازارو ئەشکەنجەی دڵدا ئەژی •
- بە زوربەی کات کلیلی ماڵ دائەخرێ •
- دەرگای میوانداریی‌و یارمەتیی دائەخرێ •• وە هەروەها ••• وە بۆ

ئەوەی مانای ئایەتەکە پتر لێمان ڕوون ببێتەوە نموونەیەك دێنینەوە ، بۆ نموونە : پیاوێك کوڕێکی لاساری هەیەو ئەڕواتە بازاڕو جامخانەیەك ئەشکێنێ ، ئینجا خاوەنەکەی دێتە لای باوکەکەی‌و سکاڵای لا ئەکات • باوکەکەیش بۆ

ئەوەی کوڕەکەی تەمێخوار ببێت هەڕەشەی لێئەکاتو ئەڵێت : «کوڕە لەماڵەوە دائەوە ، جارێکیتر نەڕۆیتە بازاڕ ••» •

ئایا ئـەم ڕستەیە مانـای ئەوەیـە : هەتا هەتایە ئـەم کوڕە نـابێ بڕواتە بازاڕ ••؟! دەست چلاك بێ یانە •••؟ •

یا مانای ئەوەیە ئەگەر لاسار بێت ، نەڕواتە بازاڕ ، خۆ ئەگەر لەسەرخۆو بەوێڵ بوو ئەوە قەیناکات •• ؟

٢ ـ هەر هەمان سوورەتو لە ئایەتی (٥٣)دا دەفەرموێ :

«•••• واذا سالتموهن متاعا فسئلوهن من وراء حجاب ذلكم اطهر لقلوبكم وقلوبهن ••» •

بەڵێ •• چاو چنۆکەکان ئەیانەوێ جارێکیتر بەرەو نیشانە ژەهراوییەکانی خۆیان بتەبەن ! ئەمـەیش کاتێ بۆیان یەکلا ئەبێتەوە کە بە تـەواویی پۆشاکی شەرەفت لەبەر دامـاڵنو وەك فلیمی سینەما بە شەقامەکاندا بتگێـڕنو ئەوانیش دواتکەون ، ئیتر بێدانانی هیچ پلەو پایەیەك بۆ تۆی بەڕێز • ئینجا با سەرێك لەسەرچاوەی ئایەتـەکە بدەین ، تا بزانـین بۆچی هاتـووە ••؟ وە بـۆ فەرمانی دەرکرد بە خۆداپۆشین ••؟

وە خۆ داپۆشین لەکێ ••؟ ئەو کاتە دەرئەکەوێ کە خۆ داپۆشین زۆر زۆر پێویستە •

پێغەمبەر ـ صلى‌الله علیـه وسلم ـ لە سەرەتای ئیسـلامەوە ئیشو ئەرکی ئێجگار فراوان بوو ، جـارێ خەریکی ڕێکخسـتنی سـوپا بوو ، جـارێ خەریکی دانانی یاسا گشتییـەکان بوو ، یاسا بۆ کۆمـەڵ ، یاسا بۆ تاك •• یاسـا بۆ خێزان •• یاسـا بۆ بڕینـەوەی کێشـەی نێـوان داواکـەرو داوالێکـراو ، وە هەروەها •••

خۆ ئاشکرایشە هەر مرۆڤێك ئەوەندە کاروباری وولاتی لەسەرشان بێت ئەبێ هەموو کاتو شوێنی خۆی تەرخان بکات ئینجا پیا ئەگات •

شتێکی سروشتی‌یه لەم هات‌وچووەدا هەموو جۆرە کەسێك دێتو ئەڕوا بە ناو خێزاندا ، واتە چاکو خراپ •

بۆیە (عومەری کوڕی خەتتاب) • خـوا لێی ڕازی‌بێت • داوای کـرد لە پێغەمبەرو ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا بەهۆی ئەم هەموو ئیش‌و ئەرکەوە هەموو جۆرە پیاوێك سەرت لێ‌ئەدات ، خۆزگە فەرمانت بدایە بە خێزانەکانت خۆیانیان داپۆشایە لە ئاستی بێگانە •••» •

لەم ووتو وێژەدا بوون ئەم ئایەتەی بەردەستمان هاتە خوارەوە ، هەروەکو هاتیش بۆ یەکەمجار لە ماڵی پێغەمبەرەوە دەستی پێ‌کرد ، بۆ ئەوەی ببێ بە پەندو عیبرەت بۆ هەموو ئافرەتانی تری جیهان ، چونکە لەکاتێکدا خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیـه وسلم ـ پێویستیان بە خۆداپۆشین ببێ ، ئیتـر ئەبێ خەڵك بە هەڵەو داوان بڕۆن بەدەم ئەم یاسا قەشەنگەوە ـ یاسای خۆداپۆشین ـ بێ چەندو چوون ••!!

کەوابوو ئەم خۆداپۆشینە لەکاتێکدایە کە پیاو خراپ لەئارادا بێت بەپێی فەرموودەکەی پێشەوامان عومەری کوڕی خەتتاب (چاکو خراپ ڕووت تێ‌ئەکەن ـ یدخل علیك البر والفاجر) •

بەڵام لەبەرئەوەی کە هەموو مرۆڤێك خاوەنی ئارەزووە ، وە هەرکات ئەو هێزە هاتـە کوڵ سەری خـۆی بۆ ئەکات بـە پەتەوە بۆ دامرکاندنـەوەی ••!! ئاشکرایشە تا ئـەم نێرومێ‌یە تێکەڵ بن ئارەزوویان پەرەئەسێنێ‌و بۆیـان کپ نابێتەوە ، ئینجا هەوڵ ئەدات بۆ نزم‌کردنەوەی بە هەرجۆر بۆی بگونجێت ••!

جا لەبەر ئـەوە ئیسلام (احتیاط)ی کـردو یاسای گشتیی دانا بـۆ چاکو خراپ‌و بڕیـاریدا هـەردوو لایان نـابێ تێکەڵاوی ئافـرەت بـکەن بـۆ ئەوەی خراپکارەکە بەهۆی چاککارەکەوە ڕانەبوێرێ بەسەر شەرەفی ئەم‌و ئەوەوە •

بەڵێ هەندێ‌کەس ئەڵێن : مرۆڤ تا شتی لێ‌بگریتەوەو لێی یاساغ بکەیت، ئەو سوورتر ئەبێت بـۆ شکاندنی ئەو یاسایەو خۆ گەیاندنی بەو شـتە قەدەغە

کراو-یه ۰۰۰!! واتــه ئافرەت تا قەدەغە بکرێو دوور بخرێتەوە لــە مرۆڤ مەردم زیاتر هەوڵی بــۆ ئەدات ، بەڵام ئەگەر بەرەڵلاکرا لەگەڵ پیــاودا ، وە بەیەکەوە گەورە بــوونو هەڵسوکەوتیان بــەیەکەوە بوو رایــێن ۰۰! بەو مانایــە هەستی دەروونییو (سێکس)یەتیان نامێنێ ۰۰!! ۰

ئێمە پرسیار لــەو کەسانە ئەکەین کەوا ئەڵێــن : (ئایا نەخۆشــێك دکتۆر شتێکی لێبگرێتەوەو پارێزی بۆ دابنێت ، ئەو شتە دووربێت ۰۰ باشتر ئەتوانێ پارێزەکەی بباتە سەر ۰۰؟ یا لەبەر دەستیا بێت ، هەموو کات ۰۰؟!) ۰

یا ئەگەر برسیت بێ ۰۰ ئایا تەنها بە دانانی (خواردەمەنیی) لەبەردەستتا تێر ئەبیت ۰۰؟!

مەسەلەی (ســێکس)یەتییش هەر وایە ، واتە تا ئافــرەت دووربێت لێتەوە پارێزراوتر ئــەبێت ، ئازاری دەروونت کەمتر ئەبێت ، وە زۆر کــەم دڵت داوات لێئەکات ۰

یا ئەوانەی کە ئەڵێن : (هەرشتێ ماوەیەك تێکەڵاویت بوو لەگەڵیا هەستت ئەمرێ بەرامبەری ۰۰!!) ئەڵێین ئایا مرۆڤ بۆ هێزی سێکسیەتی نامرێ بەرامبەر بەو خێزانەی شەووڕۆژ بە یەکەوە ئــەژین ۰۰!! کەوابوو ئەم داوایە پووچەڵو بێناوەرۆکە ، وە لــە ڕاستییەوە دوورە ، چونکە مەردم کە خوای گــەورە ـ جل جلالە ـ دروســتی کردووەو خســتوویەتییە ئەم ســەرزەوییە ـ بۆ ئەوەیــە کە ئاوەدانی بکاتەوە بــە پێی فامو ژیــری خۆیەوە ـ لەگــەڵ هێــزی (جنسی)یەتا ناردوویەتی ، چونــکە ئەو هێزە زیاتر پاڵ ئەنێ بە مرۆڤەوە بۆ هــەوڵو تەقالاو کۆششو ئاوەدان کردنــەوەی ئەم جیهانــە ، وە ئەڵێم تا جیهان جیهانــە ئاوەدان نابێتەوە تا ئــەو دوو کەسە ـ پیاوو ئافــرەت ـ یەك نەگرنو نەبنــە هاوسەری یەکتر ۰

وە ئەو کەسانەی ئەڵێن ئێمە چەند ساڵە واین بە یەکەوەو هیچیش نەبووە ئەبێ چییان مەبەست بێو ؟ مانای چیبێ (هیچیش نەبووە ۰۰!!؟)

بەڵێ : ئیسلام کە ئەڵێت (لە پشت پەردەوە شتیان لێوەرگرن) ـ هەرچەندە ئەم ئایەتە : «واذا سئلتموهن متاعا فسئلوهن من وراء حجاب ٠٠» ٠

تایبەتییە بە هاوسەرەکانی پێغەمبەرەوە ـ صلی الله علیه وسلم ـ بەڵام مەبەست ئەوەیە تێکەڵاویی ناپاکان نەکەن ، ئەگەر نە بە شێوەیەکی غیرەتو شەرەف بێت هیچ ئەرمجێ نییە لەپشت پەردەوە نەبێت ، بەڵگە بۆ ئەم ووتەیە زۆرە ٠٠ یەکێ لەوانە ئەم فەرمـوودەی پێغەمبەرەیە کە (بوخـاریو موسلیم)و چەنـد کەسێکی تریش ئەیگێڕنـەوە لە (سەهلی کوڕی سـەعد)ی ئەنصاریـیەوە ٠ کاتێ (ئەبوو ئوسەیدی ساعیدی) زەماوەنـدی‌کرد ، پێغەمبـەرو یارەکانی بانگ‌کرد بـۆ سەر شادی‌یەکەی ، لـەم شادی‌یەدا هەر نانو ئاوێکیان بۆ دانرا (ئـوم ئوسەید) بۆی دانان ٠

زانا ئاینیـەکانیش ـ وەك شێخی ئیبنی حەجەرو هەندێ زانایتـر ـ وایان وەرگرتووە لەم هەڵسو کەوتەدا بۆ ئافرەت دروستە خزمەتی میوانی پیاو بکات ، وە هاتوچۆی ناویان بکات بە ئەندازەی پێویست ٠

٣ ـ سوورەی «النساء» ئایەتی ٣٤ ئەفەرموێ :

«الرجال قوامون على النساء بما فضل الله ٠٠٠» ٠

بـەڵێ ٠٠ دوژمنـانی ئیسـلام هەمـووکات وان لـە سـەنگەری درۆو پروپاگانتەدا ، وە بـە هەموو جۆرە دیعایـەو چاووڕاو ئەکەن دژی ئیسـلام ، تا بەشکوم بە ئـارەزووی خۆیان بەردڵـلایی‌یان بۆ بلوێت ، ئەمـەیش کاتێ ئەبێ ئافرەت مل بـە هیچ یاسایەکی ژنو مێردیی نەداتو خـۆی سەرپەرشتی‌یکەری خۆی بێتو ژیوار ئـەو پەیدای بکات ، واتە تا بە ناوی ئیش‌وکارەوە لـە خانەو لانەی خۆی بێتە دەرەوەو بەتەواوی بۆ ئەوان دەرکەوێ ٠ بۆیە رەخنە ئەگرن لە سەرپەرشتی کردنی پیاو بۆ ئافرەت «قوامة» ٠ واتـە رازیی نابن پیاو چاودێری ئافرەت بکات ژیوارو ژیانی بەدەستەوەبێت !!

بەڵام خۆ هیچ گومانی تێدا نییە کە هەموو خێزانێك ئەبێ چاودێری‌کەرێکی ببێت ،

کاروباری ژیارو ژیانی ئەم جیهانە لەوەوە وەربگرێت ، وە خێزانەکەیش گوێ ڕایەڵی بکەن .

دەی خۆ ناگونجێت ئەم چاودێری کردنە بدرێتە دەست پیاوو ئافرەت ، واتە هەردووکیان بەرپرسیاربن لێی ..! چونکە دەمەقاڵێو ناکۆکیی پەیدا ئەبێت لە نێوانیاندا ، پیاوەکە ئیشێ بەباش ئەزانێ ، ئافرەتەکە بە باشی نازانێ . ئیتر یاسای ژنو مێردیی تێکئەچێ لە نێوانیاندا ... بێجگە لەوەیش ئافرەتەکە تووشی چەندەها نەخۆشیی دەروونی ئەبێت ، چونکە ئەیەوێ شانبەشانی پیاوەکە دەرچێت لە ئیشوکاردا ، خۆ ناشتوانێت ، چونکە بونیەی لاوازو بێهێزە ، سەرئەنجام ئەم خێزانە سەری لێتێکئەچێو چەواشە ئەبێ . شتێکی ئاشکرایشە خێزان هەر ئەبێ چاودێریکەرێکی ببێو هەوڵی بۆ بداتو نەهێڵێ ژیوارو ژیانی بووەستێتو ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی ڕاوەستێت ، وە ئەبێ هەوڵ بدرێ لە دانانی ئەم سەردەک خێزانەدا کێ ئازاو چالاکو لێهاتووە ئەوە دابنرێت ، چونکە ئەگەر دەزگایەک کارگێڕەکەی چالاک نەبێت ، سەرئەنجام ئەو دەزگایە ئەتوێتەوەو فەشەل ئەبێت .

خۆ خێزان گرنگترە لە هەر دەزگایەک لێ پیلێیت ، چونکە بناغەی کۆمەڵە ، کەوابوو ئەبێ کێ ڕێکوپێکو ئازا بێت «چاودێریکردن» بە دەست ئەوەوە بدرێت ..! شتێکی ڕوونە پیاو زیاتر تاقیکردنەوەی هەیە لەم بووارەدا ، چونکە سروشتی وای هێناوە هەڵسوکەوتیو جموجوڵی پترترە لە ئافرەت ، کەواتە ئەم کایلە ئەبێ بدرێتە دەست پیاو ..!

ئەمەیش نیشانەی چاکیی پیاوو خراپیی ئافرەت نییە .. تا لۆدەی ئافرەت بکرێتو ئافەرینی پیاو تۆمار بکرێ .. نەخێر بەڵکو ئەمە تەنها ئەوەندەیە زیاتر ئیشوکار بەسەر پیاودا سەپێنراوە !! .

واتە ئەرکی سەرشانی پیاو زیاترە لە هی ئافرەت ، کەواتە ژیانو ژیواری ئافرەت لەسەر پیاوە ، وە ئەگەر کەمتەرخەمیی کرد لە پەیداکردنی نانو تفاقدا ،

ئافرەتەکە ئەتوانێ بەلایەوە دانەنیشێو نیکاحەکەیشی هەڵوەشێنێتەوە ۰۰! دەی ئیتر ئەگەر پیاو بکرێ بە بەرپرسیار لە خێزان هیچ زیانێ تووشی ئافرەت ئەبێ ۰۰ یا رێزی ئەشکێ ۰۰؟ تا لەملاو لەولاوە مافدۆزان هاشاوڵ بێنن ؟!!

دیسانەوە پیاو چونکە ماندووە ئەبێت لە پەیداکردنی خۆراکدا ، ئەو رەواترە بۆ چاودێری ماڵو سامان ، لەوەی ماندو نابێت تیایا ۰۰!! هەر وەك زانایانو یاساناسان ئەڵێن : «ئەو کەسەی پارەو پوول پەیدا ئەکات مافی چاودێریی بۆ ئەوە» ۰

مەرجی ئەو کەسەی چاودێریی ئەکات ئەوەیە کە : دووربین بێت ۰۰ بیرو هۆش داربێت ۰۰ داناو زانا بێت ۰۰ ئەم وەسفانەیش لە پیاوا ـ بە زۆربە ـ زیاترن لە ئافرەت ، چونکە ئافرەت زوو شوێنەواری خۆشیو ناخۆشیی تەئسیری تێ ئەکات ، (عاطفە)و سۆزی زیاترە ۰

ئەمەیش زیان لە رێزو کەرامەتی ئافرەت نادات ، چونکە خوا ـ جل‌جلالە ـ وای دروست کردووە کە بە کەڵکی دایکیەتیو لەلەو بەخێوکردن بێت ، دەی ئەگەر دڵ رەقو بێ سۆز بێت ، لەکوێ ئەتوانێ ئەو هەموو ئەزیەتو سزایە قبووڵ بکات ۰۰!! ۰

کەوابوو ئیتر هەقی خۆیەتی پڕ بە دڵ بڵێین : خوایا هەموو ئیشو کارێکت پڕە لە حیکمەتو فەلسەفە ۰۰۰! ئێمە نایزانین ، ئێمە لە خۆمانەوە قسە ئەکەین ۰۰!!

ئەوەیشمان لە بیر نەچێت ئەم چاودێرییەی پیاوە کاتێکە فامیدە (رەشید) بێت ، واتە مەسلەحەتی دینو دونیای بزانێ ، ئەگینە ناهێڵرێ لەو ماڵە فلسە سوورەیێ خەرج بکات ۰۰! ئەمەیش شەریعەتی ئیسلام پێی ئەڵێت (حجر) : کە وابوو شێتو منداڵو ئەو کەسەی ماڵی خۆی لە حەراما بفەوتێنێ «قاضی» حیجریان لەسەر دائەنێتو ناهێڵێ هیچ مامەڵەیە بکەن !!۰

وە هەروەها چەند شتێکی تر هەیە لە ئافرەتا ، وەکو (حەیزو زكبوونو نەخۆشیی پاش منداڵ بوونو شیردانو بەخێوکردن ۰۰) پشتگیریی چاودێریی

پیاو ئەكەن ، چونــكە ئافرەت لەو كاتــەدا تووشی چەندەها نەخــۆشییو لاوازیی ئەبێت ، وە لەگەڵ ئەوانەدا حەوسەڵەی ئیشوكارو ســەرپەرشتیی نامێنێ ۰۰!!
وەك دكتۆر (فواستشفسكی)و (سكفسكی) ددان بەم ڕاستیی‌یەدا ئەنێن ۰
(لانبسكی) ئەڵێت : لە ماوەی حەیــزا ئافرەت سەربەستیی خۆی لە كیس ئەدا ، واتە ئاگای لە خۆی نامێنیو ئەندامەكانی تێك‌ئەچن ۰۰!
ئەمانەو وێنەیــان زۆرە كە گەواهیی ئــەدەن لەسەر ئەوەی كــە ئافرەت تووشی ئەو نەخۆشییو گیروگرفتانە ئەبێت ، كەوابوو ئەگەر ئیشیشی پێ‌بكەیت باری زیاتر قورس ئەبێتو هەست بە چارەڕەشیی خۆی ئەكات ۰۰!!
ئینجا داوا ئەكات كە پیاو بەو ئیشــانە هەڵسێت ، چونكە ئەم نەخۆشییو لاوازی ناهێڵێ بــە ئەركی سەرشانی خــۆی هەڵسێ ۰۰!! وەك لــە «بۆن» واتە ئەڵەمانیای ڕۆژئاوا ئەمە ڕوویدا ، وە لاپەڕەی «تیمس»ی لەندەنیی بڵاوی كردەوە لە ڕۆژی ۳۱ـ۷ـ۱۹٦٦دا ۰
بە كورتیی :
هەندێ لەوانەی چاویان بڕیوەتە (فەرەنسەو سویدو نەرویج) بە لایانەوە وایە چاودێریی كردنی پیاو لە ژیوارو ژیانلدا دكتاتۆرییو خود پەرستیی‌یە !
ئەمەیش ئەگەر تەماشــای ئایەتی (۲۱)ی ســوورەتی «الروم»(۱) بكەین بە ووردیی بۆمان ڕۆشن ئەبێتەوە كە بێجگە لە درۆو چاوبەس هیچی بەسەر هیچەوە نییە ، چونــكە ژنو مێردیی لە ئیسلاما لەسەر هێمنییو ســۆزو خۆشەویستیی دارێژراوە ، دەی ئیتر دكتاتۆرییو خودپەرستیی لە كوێ ۰۰!!(۲) ۰
٤ ـ ئایەتی /۲۸۲ :
«واستشهدوا شهيدين من رجالكم فان لم يكونا رجلين فرجل وامرأتان ممن ترضون من الشهداء ان تضل احداهما فتذكر احداهما الاخرى ۰۰» البقرة ۰

---

(۱) (ومن آياته ان خلق لكم من انفسكم ازواجا لتسكنوا اليها وجعل بينكم مودة ورحمة) ۰

(۲) الاسلام وقضايا المرأة ، ل۳٦ـ٥٦ بە كورتی ۰ لە نووسینی ماموستا ابراهيم النعمة ۰

بەڵێ ٠٠ هەڵمەتی دوژمنانی ئیسلام لە سنوورێکدا ناوەستێ ، بەڵکو ووردبین ئەکەنە چاویانو ئەگەڕێن بە دوای ڕەخنەکارییدا تا بەشکوم لە ئیشەکەیاندا سەرکەوتووبن ٠٠!

ئەمجارەیش لێرەوە دێنە ژوورەوەو ئەڵێن :

بۆچی ئافرەت وەك پیاو تەماشا ناکرێ ٠٠؟ بۆچی دوو ئافرەت بە یەك شایەت دائەنرێن ؟ لە کاتێکا لە پیاواندا یەك پیاو بەسە ٠٠٠؟! بۆچی ئافرەتیش وەك پیاو نەبێت ٠٠؟ بۆچی ئەوەند بێ ڕێز تەماشا بکرێ ٠٠؟!!

بەڵێ : ئەگەر سەرنجی ئایەتەکە بدەین بۆمان دەرئەکەوێ ، کە ئەوانە خەریکی بازرگانیین زۆربە لە پیاوانن ، واتە وەك بفەرمێ : ئافرەت پێویستیی بە بازرگانییو ئیشی دەرەوەی ماڵ نییە ، چونکە ئەو ژیواری لەسەر پیاوە چ پێش شووکردنیو چ دوای شووکردنی ، کەواتە ئافرەت کەم تێکەڵی کڕینو فرۆشتن ئەکات بەپێی سروشت ، کەوابوو زۆر دڵیشی پێوە نابەستێتو شارەزاییەکی ئەوتۆیشی نابێت ، جا لەبەر ئەوە بیرو هۆشی پەرتەوازە ئەبێت لە کڕینو فرۆشتندا ! ئینجا ئیسلام (احتیاط)ی بەکار هێنا لە بابی شایەتییداو ووردەکاریی کرد ! فەرمووی :

«أن تضل احديهما فتذكر احديهما الاخرى ٠٠» ٠

لەبەر ئەوە زۆر گوێ بە مامەڵە نادات زۆربەی شتی لەبیر ئەچێتەوە ، بۆیە ژنێکی تر خراوەتەوە پاڵی تا بەڵکو ئەمیان یارمەتی ئەو بداتو بیری بخاتەوە ٠٠!

لەولایشەوە ئافرەت ـ وەك وتمان ـ دڵی نەرمو نیانەو سۆزی زیاترە لە پیاوو زووتر تێكئەچێو گریان ئەیگرێت ٠٠ نابینی ژنو پیاوێك بڕۆن بەسەر ڕووداوێکدا پیاوەکە خۆی بۆ ئەگیرێو ئافرەتەکە گریان ئەیگرێت ٠٠ !!

ئاشکرایشە هەرکەسێك گریان بیگرێتو تووشی دڵ ناڕەحەتیی ببێ هۆشو بیری تێكئەچێ ! ئینجا شتیشی لەبیر نامێنێ تا بیگرێتەوە ، هەروەك زانا دەروون ناسەکان ئەمە ئەسەلمێننو ددانی پیادا ئەنێن ٠

بێجگه لەمانەیش ئافرەت تووشی (حەیزو منال بوونو بەخێوکردن) ئەبێت که نه کاتی ئەمانەدا ووزەی نامێنێو بیروژیریی ئەڕوات ٠

با ئەمەیش پشتگوێ نەخەین که زانـایانی چەرخی پێشو دوایی ـ علماء السلف والخلف ـ رایان وایه که شایەتیی ئافرەت ڕەوایه له هەموو شتێکا تەنها (حدود وقصاص) نەبێت ـ وه لەهەندێ جێگایشدا ژنو پیاو وەك یەك شایەتی‌یان وەرئەگیرێ وەك له (لعان)دا ٠

وه هەروەها هەندێ شت هەیه ئافرەت به تەنها شایەتی‌ی لێ وەرئەگیرێو بڕیاری لەسـەر ئەدرێت ، وەك مەسـەلەی منـال بوونو شیر خـواردنو هەندێ شتی‌تر ٠٠ نەك هەر ئەمه ، ئەوەته زۆربەی ئاثرەته (صەحابی)یەکان ـ بەتایبەت هاوسـەرەکانی پێغەمبـەر ـ صـلی‌الله علیـه وسـلم ـ وه هەروەهـا بـڕێ لـه دواکەوتووەکان (تابعیات) چەندەهـا فەرمووده ئەگێڕنەوه ، وه لـه شەریعەتی ئیسلامیشدا وەرگیـراونو هیچ کەسێکیش هەستی بریندار نەکـردوون ، واته (علماء الجرح والتعدیل) ڕەخنەی لێ‌نەگرتوون ، کەچی (ئیمامی زەهەبی) ڕەخنەی له چوار هەزار پیاو گرتووه ، لەوانەی فەرموودەیان گێڕاوەتەوه٠٠!!(١) ٠

٥ ـ سوورەی (النساء) ئایەتی (١١) :

«یوصیکم الله في اولادکم للذکر مثل حظ الأنثیین ٠٠٠» ٠

خوشکی بەڕێز :

هەروەك پێم‌وتی لەپێشەوه دوژمنانی ئیسلام هەر جارەی له کونێکەوه سەر دێننه دەرەوەو سەرەتاتکێ ئەکەن ، تا بەڵکو لەلایەکەوه جێگەی سەریان ببێتەوه ، ئینجا خۆیشیان جێگەی قاچیان ئەکەنەوه ٠٠! کەوابوو ئاگاداربه ٠٠ وریابه ٠٠ بەخەبەربه ٠٠ ئەوەتـه جارێکی‌تریش هاتەوه بـۆ لات ، بەڵکو به هـەر قیمەتێ بووبێت ، دڵت بگـۆڕێ سەبارەت بـه ئیسلام وه بـۆ ئەوەی ناشـیرینی بکات له لات ٠٠!! بۆیه ئەڵێن :ـ

---

(١) الاسلام وقضایا المرأة ، ل٢٢ـ٣٤ به کورتی ٠

بۆچی ستەم ئەکەن لە ئافرەتو وەکو پیــاو تەماشای ناکەن لە میراتا ٠٠؟

واتە نەك ئاوا بە سووكو سادە داوا بكەن ، بەڵكو لە ٢٣ـ١٢ـ١٩٢٨دا «سەلامە موسی» لە کۆڕی لاوانی مەسیحیدا ئەم ڕەخنەیەی درکانو (محاضره)یەکی درێژی دا لەو بارەیەوە ٠٠! ئینجـا داوایشی کرد لــە بەڕێوەبەری یــەکێتیی ئافرەتانی میسر کە داوا بـکەن لــە وەزارەتی دادپــەروەریی بــۆ ئەوەی یاســایەکی تازە هەڵبژێرنو ددان بنێت بە یەکسانیی ئافــرەتو پیاودا لە میراتا ٠٠!! بەڵێ ٠٠ ئەو کرمە نەتۆپیوەو ئێستایش هەر ئەجووڵێتەوە لە دڵە نەخۆشەکاندا ٠٠ ئەو دڵانەی عاشقی بێگانەن ٠٠!

دەی ئایا ڕاســتە ئایینی ئیسلام ستەمی کردووە لە ئافرەت ، مــافی خۆی نەداوەتێ لە میراتا ٠٠؟!

پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە سەرێك لە وڵاتە نا موسڵمانەکان ئەدەین ـ بە کۆنو تازەوە ـ تا دەرکەوێ ڕاستییو یەکسانیی ئەوان سەبارەت بە ئافرەت ، وە ستەمی ئیسلام لێی ٠٠!

لە (یۆنــان)دا بــە تــەواویی ئافــرەت بێبەش بــوو لە میــرات ، تەنانەت ئەیانووت : ئاخۆ ئافرەت خاوەنی گیان بێت ٠٠؟ ٠

لە (ڕۆمان)دا ئافرەت زیاتر نەبوو لە (یۆنان) ٠

لە ڕۆژهەڵاتیشــدا وەکو «طورانیو کلــدانیو فینیقیو سریــانیو ئارامی» بەشی منداڵو ئافرەتیان دانەئەنا ٠٠! ٠

جوولەکەیش : ئەگەر کەسێك بمردایەو کوڕی ببوایە سامانەکەیان هەموو ئەدرا بە کوڕەکە ٠٠! ئیتــر بەشی ژنو کچو خزمەکانی تریانی نەئــەدا ، تەنانەت ئەگەر کەسێك بمردایە کچێكو کوڕی کوڕێکی لێ بەجێ بمایە ماڵەکەیان هەموو دائەنا بۆ کوڕەزاکەیو کچەکەی خۆیان بێبەش ئەکرد ٠٠!

لەسەردەمی نەفامیشا هەرکەسێك بەسەر ووڵاغەوە خۆی نەگرتایە ، واتە نەیتوانیایە جەنگ بـکات لەگەڵ دوژمندا ـ وەکــو ئافرەتو منداڵ ـ لــە میراتا بەشیان نەئەدا ٠٠!! ٠

هەتا کاتێ ئایەتی میرات هاتو بەشی ئافرەتیشی دیاریی کردو هروشمیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ـ صلى‌الله عليه وسلم ـ چـۆن ؟ ـ ئەی پێغـەمبەری خوا کابرایەك بمرێ تەنها کچێکی ببێ ، واتە کوری نەبێ نیوەی ماڵەکەی ئەبات ۰۰؟!! لەکاتێکا جەنگاوەر نییە ۰۰!

ئینجا لەم کاتەدا کە ڕۆشنایی ئافرەتی تیا نییە ، وە شەوەزەنگو تاریکی‌ی بەختی ڕەشی داپۆشیوە ، تیشکی ئیسلام لە ئاسۆی کەلدا خۆی نوانـدو مافی زەوت کراوی چەند ساڵەی ئافرەتی زیندووکردەوەو فەرمووی :

«للرجال نصيب مما ترك الوالدان والاقربون وللنساء نصيب مما ترك الوالدان والاقربون مما قل منه او كثر نصيبا مفروضا ۰۰» النساء/۷ ۰

بۆ ئادەمیزادی نێرینـە بەشێ هەیە لەوەی باوكو دایكو خزمـان بەجێیان هێشتووە ۰۰ هەروا بۆ مێینەییش بەشێ هەیە لەوەی کە باوكو دایكو خزمانی نزیکیان بەجێیان هێشتووە ، لەوە کەم بێ یا زۆر لەو میراتە کە بەجێماوە ، وە ئەم بەشە خودا بڕیاری داوە بۆیان ، واتە بە ئارەزووی ئەوان نی‌یە وەری‌بگرن یا وەری‌نەگرن ماڵی ئەوانە ۰۰(۱) ۰

بەڵێ ۰۰ ئایینی پیرۆزی ئیسلام بـەشی تایبەتیی دانا بۆ ئافرەت ، وە بە خاوەن گیانو نیـوەی کۆمەڵی دانا ۰۰ وە هیچ زۆرو سـتەمێکی لێ‌نەکردووە ، وەك ناپاکان ئەڵێن ۰۰! ۰

ئەی بۆچی سـتەم بێت لە ئافرەت ئەگەر نیوەی پیاو ببا لـە میراتا ۰۰ ؟ لەکاتێکا پیاو هەرکات هاوسەری هێنا ئەبێ مارەیی بداتێ ، وە پێویستە لەسەری کە ژیانو ژیواری مسۆگەر بکات با ئافرەتەکە زۆریش دەوڵەمەند بێت ! ۰
وە هەروەهـا پێویستیی ناوماڵو کەرەسەی ناوماڵی بۆ ئامـادە بکات ۰۰! نەك بە پیاوەتیی‌و منـەت ، بەڵکو پێویستیی سەرشانیەتی ۰۰ تەنانـەت ئەگەر

---

(۱) تەماشای تەفسیری نامی بکە ، بەرگی دووەم ، ل۲۵۱ـ۲۵۳ ۰

ژیانی باش نەئەبرد بەڕێوە ، بۆی ڕەوایە داوای جیابوونەوەی لێبکات ! ئەگەر لای باوکو براو خزمو کەس‌وکاری بوو پێویستە بە ڕێك‌وپێکیی ژیانی بۆ دیاریی بکەن ، ئەگەر هاتو گوێیان نەدایە ، دادگا بە زۆر جیرەی بۆ دائەنێت٠!٠

بێجگە لەمەیش ئافرەت ژیانی منالی لەسەر نییە ، بەڵکو لەسەر پیاوە ! خۆ ئەگەر تەڵاق‌درا ، وەیاخۆ مێردەکەی مرد ، دیسانەوە تفاقو ژیانی ئەچێتەوە سەر کەس‌وکاریی وەك پێش شووکردنی ٠٠! ٠

خۆ ئەگەر سەرلەنوێ شویش بکاتەوە نەفەقەی ئەکەوێتە سەر ئەم مێردە تازەیەی ٠٠ وە هەروەها چەندان مافی‌تر هەیە لەسەر پیاو ، کەوابوو پیاو زیاتر پێویستی بە پارە هەیە لە ئافرەت ، بۆیە دووقاتی ئافرەتی بۆ دەستنیشان کراوە ٠٠! ٠

«للذكر مثل حظ الانثيين ٠٠»

وا بەم چەند ووشەیە دەرکەوت ٠٠ بۆچی ئیسلام دوو ئەوەندەی ئافرەتی داناوە بۆ پیاو ٠٠ وە فەلسەفەو حیکمەتی چییە ٠٠؟

دەبا هەموو کەس بزانێ ئیشی ئیسلام گۆترەکاریی نییە ، واتە تا ئەو شتە هەڵنەسەنگێنێ بڕیاری بۆ دەرناکات ٠ دیسانەوە ڕۆشن بووەوە کە مەسەلەکە وەك دوژمنان ئەڵێن ، مەسەلەی بێڕێزیی‌و سووکیی ئافرەت نییە ، چونکە بڕێکات ئافرەتیش وەك پیاو بەش ئەبات ٠٠! وەك :ــ

١ ــ برای دایکی ئەگەر هەر خۆی بوو ١/٦ ئەبات ٠ لەولایشەوە ئەگەر خوشکی دایکی بوون‌و کەس بێبەش (حجب)ی نەکردن‌و هەر خۆیان‌بوون ئەوانیش ١/٦ ی ئەبەن ، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەفەرموێ :

[illegible] ، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەفەرموێ :

«وان كان رجل يورث كلالة او امرأة وله اخ او اخت فلكل واحد منهما السدس» ٠

٢ ــ کەسێك بمرێ منالی نێرینە ، وەیا نێرینەو مێینەی لێ بەجێ بمێنێ

هەتا کاتێ ئایەتی میرات هاتو بەشی ئافرەتیشی دیاریی کردو هروشمیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ـ صلى‌الله عليه وسلم ـ چۆن ؟ ـ ئەی پێغەمبەری خوا کابرایەك بمرێ تەنها کچێکی ببێ ، واتە کوڕی نەبێ نیوەی ماڵەکەی ئەبات ٠٠؟!! لەکاتێکا جەنگاوەر نییە ٠٠!

ئینجا لەم کاتەدا کە ڕۆشنایی ئافرەتی تیا نییە ، وە شەوەزەنگو تاریکیی بەختی ڕەشی داپۆشیوە ، تیشکی ئیسلام لە ئاسۆی کەلدا خۆی نواندو مافی زەوت کراوی چەند ساڵەی ئافرەتی زیندووکردەوەو فەرمووی :

«للرجال نصيب مما ترك الوالدان والاقربون وللنساء نصيب مما ترك الوالدان والاقربون مما قل منه او كثر نصيبا مفروضا ٠٠» النساء/٧ ٠

بۆ ئادەمیزادی نێرینە بەشێ هەیە لەوەی باوكو دایكو خزمان بەجێیان هێشتووە ٠٠ هەروا بۆ مێینەییش بەشێ هەیە لەوەی کە باوكو دایكو خزمانی نزیکیان بەجێیان هێشتووە ، لەوە کەم بێ یا زۆر لەو میراتە کە بەجێماوە ، وە ئەم بەشە خودا بڕیاری داوە بۆیان ، واتە بە ئارەزووی ئەوان نییە وەریبگرن یا وەرینەگرن ماڵی ئەوانە ٠٠(١) ٠

بەڵێ ٠٠ ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەشی تایبەتیی دانا بۆ ئافرەت ، وە بە خاوەن گیانو نیوەی کۆمەڵی دانا ٠٠ وە هیچ زۆرو ستەمێکی لێنەکردووە ، وەك ناپاکان ئەڵێن ٠٠! ٠

ئەی بۆچی ستەم بێت لە ئافرەت ئەگەر نیوەی پیاو ببا لە میراتا ٠٠ ؟ لەکاتێکا پیاو هەرکات هاوسەری هێنا ئەبێ مارەیی بداتێ ، وە پێویستە لەسەری کە ژیانو ژیواری مسۆگەر بکات با ئافرەتەکە زۆریش دەوڵەمەند بێت ! ٠

وە هەروەها پێویستیی ناوماڵو کەرەسەی ناوماڵی بۆ ئامادە بکات ٠٠! نەك بە پیاوەتیی و منەت ، بەڵکو پێویستیی سەرشانیەتی ٠٠ تەنانەت ئەگەر

---

(١) تەماشای تەفسیری نامی بکە ، بەرگی دووەم ، ل٢٥١ـ٢٥٣ ٠

لەگەڵ باوکو دایکیا ، لەم مسەلەیەشدا دایکەکە ـ کە مێینەیە ـ ئەندازەی
باوك ئەبات بێ زیادوکەم ، واتە 1/6 شەش‌یەك ..» .

«ولأبویه لکل واحد منهما السدس مما ترك ان كان له ولد ..» .

کەواتە ژیریی‌و بیری ڕاستەقینە ئەڵێت :

زۆر زۆر جێگەی خۆیەتی پیاو دوو ئەوەندەی ئافرەت ببات ..!

چەند جوان ددانی ناوە بە یاسای ڕێکو پێکی ئیسلامدا ، دکتۆر ـ گوستاف لوبون ـ فەیلەسووفی فەرەنسی ـ کە ئەڵێت :

«یاسای ئیسلام مافی ئافرەتی داناوە لە میراتا بە شێوەیەك ، کە هاو وێنەی نییە لە یاساکانی ئێمەدا ..» .

دوای ئەم ئەندازە لێکۆڵینەوەیە لەم باسەو باسەکانی‌تری ئافرەت ئینجا فەرموو خۆت ناوبژیکەربە .. ئایا ئیسلام ئافرەتی چەوساندووەتەوەو مافی ڕۆژانەی لێ زەوت کردووە ..؟ ناهێڵێ سەر بێنێتە ڕۆشنایی ؟! ئەی بۆ خێزانی موسڵمانانی پێشوو بە ئارەزووی خۆیانو بە گوێرەی پێویست هاتو چۆی بازاڕیان کردووە ، بێ‌ئەمەی هیچ کەسێك بەرگریی کردبێ ..؟ !

داخەکەم .. بێ لێکۆڵینەوە لە بەرنامەی ئیسلام سەبارەت بە ئافرەت ساویلکەی وا دژی ئیسلام ئەنووسێتو داوای ئازادیی ئافرەت ئەکات سەرەواوێك نەچووەتە سکیەوە ..!

بێجگە لەوانەیش لەوسەردەمەدا کە بە تەواویی ئیسلام تەتبیق ئەکراو هێشتای بە شارستانیەتیی ئەوروپاوە ئەولەق نەبووبووین .. ژنە موسڵمانەکان هاتوچۆی مزگەوتیان ئەکرد ، وە ئامادەی «جومعەو جەماعەت» ئەبوونو ئەچوونە ناو کۆڕی ئەڵقەی وانەکانەوە (حلقات الدروس) .

پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ فەرمانی‌دا بەو ئافرەتانەی پێگەیشتوونو باڵغ بوون ، وە ئەوانەی نزیکە پێبگەنو خاوەن حەیزن کە ئامادەی جەژنەکان

- جەژنی قوربانو ڕەمەزان - بین ، بۆ ئەوەی لە یاسای ئیسلام شارەزا بین :

«أمرنا رسول الله - صلى‌الله عليه وسلم - ان نخرجـن في الفطر والأضحى : العواتق والحيض ، وذوات الخدور ، فامـا الحيض فيعتزلن الصلاة ويشهدن الخير ودعوة المسلمين ٠٠ قلت يا رسول الله ، احدانا لا يكون لها جلباب ؟ قال : لتلبسها اختها من جلبابها ٠٠» (١) ٠

ئافرەت لە زانیارییدا هیچی کەم نەبووە لە پیاو ، بەڵکو زۆر ئافرەت بووە پایەو پلەی بەرزتر بووە لە پیاو بۆ نموونە :

یەکەم : خاتوو عایشە - دایکی موسڵمانان - سەرچاوەی پرس‌وڕا بووە لە لای هاوەڵانی پێغەمبـەر - صلى‌الله عليه وسلم - بۆیە پێغەمبـەر - صلى‌الله عليه وسلم - ئەفەرموێ : «نیوەی ئایینتان لە عائشەوە وەرگرن» ٠

دووەم : بەڕێز (فاطمەی علاءالدين) سەمەرقەندی‌یە ٠ ئەم ئافرەتە بلیمەت بوو ، بە شێوەیـەك هەر (فەتوا)یـەك لە لای باوكی‌یـەوە دەرچووایـە نووسینو ئیمزای ئەمیشی پێوە بوو ٠٠!

سێیەم : (ستیتە) کچی قـازی حسـین ٠ ئەم ئافرەتە زوربـەی (فیقهی) شافیعی لەبەربـووە ، وە شانبەشـانی زانـاکانی‌تر فتـوای دەرکـردووە ٠ لە (٣٧٧)ی کۆچی‌دا دونیای بەجێهێشت ٠ خوای لێ ڕازی‌بێت ٠

چوارەم : (زەینەب) کچی عەبدوڕەحمانی شەعری‌یە ٠ زانایەکی هەڵکەوتی بوو زۆربەی زاناکان ئیجازەیان داوەتێ ، وەك (ئەبولحەسەنی فارسی)و (ئەبول قاسـیمی زەمەخشـەری) خـاوەنی تەفسـیری کەششـاف ٠ هـەروەك ئەمیش - زەینەب - ئیجازەی ئیبن خەلەکانی داوە ٠٠!

پێنجەم : (کەریمە) کچی احمدی مروزی‌ی ٠ لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا - صلى‌الله عليه وسلم - دەستی باڵای بووە ، ئەوەتە (خطیبی بەغدادی) (صەحیحی

---

(١) ئومی عطیەی ئەنصاری دەری‌هێناوەو بوخاری و موسلیم نەیگێڕنەوە ٠

بوخاری) بەلاوە خوێندووە ۰۰۰۰! ۰

شەشەم : (عەنیدە) ۰۰ ئەم ئافرەتە کاتێ دائەنیشت بۆ وانە ووتنەوە (٥۰۰) پێنجسەد قوتابی دائەنیشتن گوێیان بۆ ئەگرت لە پیاوو ئافرەت ۰

حەوتەم : (رابیعەی کچی ئیسماعیل) عەدەوییە ، کە ناوبانگی هەیە لەناو خەڵکا بە رابیعەی عەدەویی ـ خوا لێی ڕازیی بێت ـ ئەم ئافرەتە خواناسە هەموو جار کە دائەنیشت بۆ ئامۆژگاریی ئافرەتان ، چەندەها ئافرەت لە دەوریا ئامادە ئەبوون بۆ ئامۆژگارییەکانی ۰۰(۱) ۰

هەشتەم : (نفیسە) کچی حەسەنی کوڕی زەیدی کوڕی حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلییە ـ خوا لێیان ڕازیی بێت ـ ئەم ئافرەتە نازناوی «شانازیی ئافرەتانی» درابوویە ۰۰! وە هەروەها لەم بابەتە ئافرەتی موسڵمان زۆرە ، وەکو خەطیبی بەغدادی لە (تاریخ بغداد)او (ئیمامی نەوەوی) لە (تهذیب الاسماء)دا نووسیویانە ۰

عەبدول واحیدی (مراکشی) ئەڵێت : لە گەڕەکی ڕۆژهەڵاتی (شاری قرطبە)دا (۱۷۰) ئافرەت بوون قورئانیان ئەنووسی بە شێوەی نووسینی کووفیی ۰

ئەوەیشمان لەبیر نەچێ کە شاری (قرطبە) (۲۱) گەڕەك بوو !

هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی مامۆستای (جزیری) کە ئەڵێت :ـ

ولو كان النساء كما ذكرنا　　لفضلت النساء على الرجال
فلا التانيث لاسم الشمس عيب　　ولا التذكير فخر للهلال

ئەمانەو وێنەی ئەمانە لە مێژووی ئیسلاما زۆرن ، وە بە ئازادییو سەربەستیی ژیانیان بردووەتە سەرو باوەشیان بە قورئاندا کردووە ، وە یەکە یەکە بەندەکانیان پیادەکردووە ۰۰ بێ ئەوەی وەڕسییو پەرێشانیی نیشان بدەن ۰۰ جلو بەرگی درێژیان لەبەر کردووە ۰۰ بۆچی (حجاب) بەرگریی نەکردن لە فێربوونی زانستو زانیاریی ۰۰؟! ۰

---

(۱) تاریخ الاسلام ، بەرگی سێهەم ، ل۲۲۱ ، دکتۆر حسن ابراهیم حسن ۰

# خۆزگە ئەمـزانی !

خۆزگە ئەمزانی کام زاناو کام فەیلەسـووف ئەڵێت : هەر ئافرەتێك جلو بەرگی شۆڕی لەبەرابێت فێری زانیاریی نابێت ۰۰؟! ۰

کام هەڵکەوتـوو بلیمـەت ئەڵێت : فیزیـاو ۰۰ کیمیـاو ۰۰ جەبـرو ۰۰ ئەنـدازە ۰۰ بـە سـەری ڕووتو گـەردنی ڕووتو ۰۰ لاقی ڕووتـەوە نـەبێت نازانرێن ۰۰؟! کام پرۆفیسۆر وتی : چارەسەری نەخۆش ئەگەر بە (حجاب)ەوە بێت ، ئەو دەرمانە (مەفعولی) نابێت ۰۰؟!

کام زانیاریی ئەڵێت : پەردە بەرگریی ئافرەت ئەکات لە پێشکەوتن ۰۰؟!

کام زانیاری ووتی : مامۆستای قوتابخانە ئەگەر بە لاقی ڕووتەوە نەبێت وانەکەی سوود بەخش نابێت ۰۰؟!

ئاخ ! ئەمـزانی خۆدەرخستن بە ڕووتوقـووتییو ۰۰ بۆیەی کولـمو ۰۰ ڕوومەتو ۰۰ لێو سوورکردن ۰۰ تا چ پلەیەك ئەبنـە هۆی زانیارییو نیشانەی پێشکەوتن ۰۰؟!

کەسێ هەیـە بڵێت تەقینەوەی شـۆڕشی پیشەسـازیی (تفجیـر الثـورة الصناعیة) بێپەردەیی سەریخستو دەستی گرت بەرەو پێشکەوتن ۰۰؟!

ئایا ئەو مرۆڤەی کە فڕۆکەو ۰۰ ئۆتۆمۆبیلو ۰۰ تەلەفۆنو ۰۰ بەخچالو ۰۰ ڕۆکێتو بۆمبای ئەتۆمو ۰۰ ژمێرەری ئەلەکترۆنو ۰۰ مانگی دەستکردو ۰۰ هتـد ۰۰ دروست کـرد لـە لاقی ڕووتی ئافـرەتو بێپـەردەیی ئافرەتـەوە فێربوو ۰۰؟!

برای خوێنەر : خوشکی بەشەرەف :

نەزانین هیچ پەیوەنـدیی بە خۆداپۆشینەوە نییە ۰۰ هەر وەك زانستو زانیاریی پەیوەندیی بـە خۆدەرخستنەوە نییە ، واتە نەزانینی فـڕۆکە دروست

کردن هیی ئەوە نییـە جلو بەرگەکەی درێـژەو ئەکەوێتە بەردەستیو ناهێڵێ (برغووەکان) ببەستێ ٠٠؟!

خوشکی بەڕێز :

لێت ڕۆشن‌بێت هـەر ڕەخنەو چاوبەسێك لە تۆی خۆشەویسـتی ئەکەن ، هەمووی بـەو جۆرەیە خرایـە پێش چـاوت ٠٠٠! بۆ ئەمەی بنـجو بنـەوانی ئایەتەکانی قورئـانو فەرموودەکانی پێغەمبەر ـ صلى‌الله علیـه وسلم ـ بزانن ، هەڵئەسن ئابڕووی خۆیان ئەبەنو دەست ئەکەن بە ڕەخنەگرتن لێیان ٠٠ چونکە بە (دڵ)یانەوە نانووسێن ٠٠!! ٠

ئەوەیش بزانە کە زۆربەی فەیلەسـووفو نووسەرە بێگانەکانیش وتەی بـەرزو پەسەندیـان هەیە لـە بابەت (حجـاب)ەوە ٠٠ وەك (ئارثـر شوبنهور) فەیلەسووفی ئەڵەمانیی لە کتێبی (کلمة عن النساء)دا وە (لورد بیرۆن) لە کتێبی (الرسائل والجرائد)دا ل٢٩٩ی بـەرگی دووەم ٠ وە (تۆلۆستۆی) فەیلەسووفی ڕووسیو ٠٠ (لادی کـوك) ئافرەتێـکی نووسـەری بەناوبانـگە ٠٠ ئەمانـەو وێنەیان تاریفو وەسفی خۆداپۆشینیان زۆر کردووە ٠

ئیتر لە پەنای قورئانا بیتو ئاگات لە خۆت بێت ٠٠ وە بیری بکەرەوە لە ژیانی پاشەڕۆژت «قیامەت» تا بەر خەشمو قینی خوا نەکەویت ٠٠ وە بە خوای گەورەت ئەسپێرم ٠

خۆتو ویژدانتو پاکیی شیرت ٠

# هەشتەم : سەربەستی‌ی بیرو ژیری‌ی

خاوەن باوەڕێـك‌و بێ‌بـاوەڕێك ئەکەونــە قــرەو موجادەلە ســەبارەت بە سەربەستی‌ی ، بێ‌باوەڕەکە :

ــ تۆ لە بیرو هۆشتا ئازاد نیت ‌٠٠!

ــ بۆچی ٠٠؟!

ــ چونکە بڕوات هەیە کە ئەم بوونەوەرە دەست‌کردی خوایەکە ٠

ــ بەڵێ باوەڕم هەیە کە ئەم بوونەوەرە لەخۆیەوە نەبووە ، بەڵکو دەست کردی خوایەکی زاناو داناو بینایە ٠

ــ نوێژو ڕۆژویشی بۆ ئەکەیت ٠٠؟

ــ بەڵێ هەموو فەرمانەکانی‌تریشی بەجێ دێنم ٠

ــ کەوابوو ڕاستە لە بیروهۆشتا سەربەست نیت ٠٠!!

چونکە باوەڕت هەیە کە ئەم بوونەوەرە (خوا)یەك دروستی کردووە ، دەی ئەمەیش لە ڕاستی‌یەوە دوورە ٠٠!

ــ ئەی ئێــوە باوەڕتان بەچی‌یــە ٠٠؟ ئــەی ئەبێ کێ ئــەم بوونەوەرەی دروست کردبێت ٠٠؟

ــ سروشت (طبيعة) دروستی کردووە ٠٠!

ــ پێم‌ناڵێیت ٠٠ سروشت چی‌یە ٠٠؟

ــ چۆن سروشت چی‌یە ٠٠! سروشت هێزێکی نهێنی‌یە ئەم‌پەڕو ئەوپەڕی بۆ نییە ، بەڵام بە دیمەن‌و ڕواڵەتی بوونەوەردا ئەناسرێت ٠

بەڵێ ٠٠ ڕەجعی‌و کۆنەپەرستم ٠٠ سەربەست نیم ٠٠ ئەگەر باوەڕم ببێ بە هێزێکی نهێنی‌و نادیــار ، وەك (خوا ــ الله) !! چونکە چاو نــای‌بینێ ، بەڵام ئەگەر باوەڕم ببێ بە (سروشت) ــ هەرچەند نادیاریشە ــ ئەوە ئیتر سەربەستم!

بەختیارم ۰! ڕۆشنبیـرم ۰۰! پێشکەوتووم ۰! جـا کەوابوو ئەگـەر مەسەلەکە گۆڕینەوەی هێزێکی نهێنی بێت ، هەر بـە هێزێکی تری نهێنی ، واتە رابکەم لە ووشەی (الله)ی زاناوداناو بیناو شنەواو کار دروستەوە ۰۰ (چونکە نادیارە !) بۆ لای (سروشت) کە ئەویش هەر نادیارە ۰ لەگەڵ ئەوەیشدا کەڕو کوێرو لاڵو بێ هەستو نەستیشە ! ۰

ئەگەر مەسەلە ئەمەبێ ۰۰ ئیتر بۆ پشت بکەم لەو خوایەی کە لە پاڵ بڕوا هێنان پێی هێمنییو ئاسـایش ئەکاوێتە دلمەوە ، وە لە دڵـە ڕاوکێو ئازاریی دەروونیی ڕزگار ئەبم ۰۰؟ ۰

واز لەم خوایە بێنـم ۰۰! بکەومە دوای خوایەك ـ سروشت ـ کە بـە هیچ جۆر وەڵامی ڕازو نیازم ناداتەوەو هیچیش نابیسێت ، سەرەڕای ئەوەیش کەڕو کوێرو لاڵیشە ۰۰؟! ۰

ماناى سەربەستیی (بیر ، ژیریی) لای چینی پێشکەوتووخوازەکان !

(الحاد)و بێباوەڕییە بە خوا «الله» ! بۆیـە ئیسلام سەربەستیی نەداوە بە ژیریی (ئەقل) ، بەلای ئەوانەوە ، چونکە داوا ئەکات لە مرۆڤ بێ بڕواهێنان بە خوا ! بەڵێ ۰۰ سەرگەردانەکان بەبێ ئەوەی شارەزاییان لە ئیسلام بێت ، یا بڵێین بێئەوەی ماوەیـەکی کەم لەگەڵ ئیسـلاما ـ هەر هیچ نـەبێت ـ ژیانیان بردبێتە سەر ، ئیسلام تاوانبار ئەکەن بەوەی کە گوایا ڕێزی «ژیریی» ناگرێ !

کەچی تەنها لە قورئانی پیرۆزدا (٤٩) جار ووشەی (عەقل) هاتووە ، ئیتر بێجگە لـە فەرمـوودەکانی پێغەمبـەر ـ صلى‌الله عليـه وسـلم ـ فەرمـوو تـۆو نەخشەیەکی ئەو سـوورەتانەی ووشـەی «عقـل»یان تیـا هاتـووە لـە قورئانی پیرۆزدا :ـ

| رقم السورة | السورة | ارقام الايات |
|---|---|---|
| | (عقلوه) | |
| ٢ | البقرة | ٧٥ |
| | «يعقلون» | |
| ٢ | البقرة | ١٦٤ ، ١٧٠ ، ١٧١ |
| ٥ | المائدة | ٥٨ ، ١٠٣ |
| ٨ | الانفال | ٢٢ |
| ١٠ | يونس | ٤٢ ، ٠٠ |
| ١٣ | الرعد | ٤ |
| ١٦ | النحل | ١٢ ، ٦٧ |
| ٢٠ | الحج | ٤٦ |
| ٢٥ | الفرقان | ٤٤ |
| ٢٩ | العنكبوت | ٣٥ ، [illegible]٣ |
| ٣٠ | الروم | ٢٤ ، ٢٨ |
| ٣٦ | يس | ٦٨ |
| ٣٩ | الزمر | ٤٣ |
| ٤٥ | الجاثية | ٥ |
| ٤٩ | الحجرات | ٤ |
| ٥١ | الحشر | ١٤ |
| | نعقل | |
| ٦٧ | الملك | ١٠ |

| رقم السورة | السورة | ارقام الايات |
| --- | --- | --- |
| | (يعقلها) | |
| ٢٩ | العنكبوت | ٤٣ |

«تعقلون»

| | | |
| --- | --- | --- |
| ٢ | البقرة | ٤٤ ، ٧٣ ، ٧٦ ، ٢٤٢ |
| ٣ | ال عمران | ٦٥ ، ١١٨ |
| ٦ | الانعام | ٣٢ ، ١٥١ |
| ٧ | الاعراف | ١٦٩ |
| ١٠ | يونس | ١٦ |
| ١١ | هــــود | ٥١ |
| ١٢ | يوسف | ٢ ، ١٠٩ |
| ٢١ | الانبياء | ١٠ ، ٦٧ |
| ٢٣ | المؤمنون | ٨٠ |
| ٢٤ | النور | ٦١ |
| ٢٦ | الشعراء | ٢٨ |
| ٢٨ | القصص | ٦٠ |
| ٣٦ | يس | ٦٢ |
| ٣٧ | الصافات | ١٣٨ |
| ٤٠ | غافر | ٦٧ |
| ٤٣ | الزخرف | ٣ |
| ٥٧ | الحديد | ١٧ |

دەی ئایا ئەمە مانـای ڕێزگرتنی ئەقڵو ژیـریی نییە ..؟! ئەمـە مانای سەربەستیی بیرو هۆش نییە ..؟

قورئانی پیرۆز داوا ئەکات لە گرۆی ئادەمیزاد کە بە ڕەش‌کوێریی بەسەر بوونەوەردا هەنگاو نـەنێن ، وە هەڕەشـە لە مـەردم ئـەکات کاتێ دوای ژیریی نەکەوێت ..!

ئایینی پیرۆزی ئیسـلام زۆر سەربـەستو ئازادە .. تایبەتیی نییـە بە چینو تاقمێکەوە .. واتە هیچ کەس ناتوانێ خۆی بکات بە خاوەنی سەرەکیی ، تەنانەت لە ئیسلاما (پیـاوی ئایین ـ رجال الدين)(١) نییە ، وەك لـە ئەوروپادا هەیە ، واتە کۆمەڵێـکی تایبەتیی نیین خۆیان بسەپێنن بەسەر ئایـینداو خۆیان بکەن بە خـاوەنی ، ئینجا لەپاڵ ئەوەدا هەرچی بەرووبـووم بێت زەوتی بکەنو دوای خۆیشیان بگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەیان ..!

ئایینی ئیسـلام هیی هەموانـەو هەمـوو مرۆڤێـك بـۆی هەیـە سـوودی لێوەرگرێت بـە پێی بیرتیژیی خۆی ، وە هەمـوو موسڵمانێك بە خـاوەن بڕوا ئەناسرێت بێ جیاوازیی لە نێوان چینەکاندا .. «هـەر یەکەیان پایەی تایبەتیی خۆی هەیە بە گوێرەی کردەوەی ..» . وە کێ لە خوا زیاتر بترسێت ئەوە لە هەموو کەس بەڕێزترە .. ئیتر (مەلا) بێت ، ئەنـدازیار بێت ، پزیشك بێت ، کرێکار بێت ، بەبێ جیاوازیی .

---

(١) پێویستە جیاوازی بخەین لە نێوان «رجال الدين»و «علماء الدين»دا ... لە چەند سەردەمێکا خـاوەن دەسـتەڵاتەکان هەوڵیان داوە ـ بـۆ ئەوەی کورسییەکەیـان نەکەوێ ـ دەسـتەیەکی ئاینییان پێك‌هێناوە ـ بـە ناوی ئیسلامەوە ناویان ناون (رجال الدين) یا «هيئة دينية» بۆ ئەوەی هەر زوڵمو ستەمێ بکەن ئەوانە پینەی بکەن بۆیان .

ئایین (پیشه نییه) ، واته وەك كارگەیەك نییە، كە یەك كەس پسپۆڕ بێت تیایا ، یا چەند كەسێك ، ئیتر لەوانە بەولاوە كەس هەقی قسەی نەبێت ۰۰!!۰

خواپەرستیی بێ (دەستگر)و واسیتە تەواو ئەبێت ۰۰ واتە بێئەوەی پێویستت بە كەسێك ببێ ئەگەر ئەو نەبێت خوا وەرت نەگرێت ۰۰!
ئەمە لەم ڕووەوە ۰۰

ئینجا لە ڕووی یاسا دانانیشەوە - بۆ ئەوەی جەنگ‌و هەرو پشێویی ڕوونەدا - شتێكی سروشتییە كە ئەبێ كۆمەڵێك پسپۆڕبن تیایا ۰۰ ئەمانەیش وەك ئەو دەستەیەن كە لە هەموو وولاتێكدا هەن‌و پسپۆڕن لە یاسادانانذا !
ئیتر بۆیان نییە خۆیان ببڕن بەسەر مرۆڤەكانیتردا بەو ناوەوە كە - گوایا - ئەوان یاسایان داناوە ۰۰! ئەبێ بالاتربن لە مافدا لە چینەكانیتر ! وەیا بەپێی بەرژەوەندیی خۆیان‌و تیرەیان تێهەڵكێشی بكەن ۰۰!

وە ئەبێ ئەو یاسایانەی داوای تۆڵە ئەكەن ئەوان نەگرێتەوە ۰۰ وە هەرچییان وت ، وتە هەر وتەی ئەوان بێت ، هەژارو بێنەوایش گەردنیان بۆ كەچ‌كەن ۰۰!! نەخێر ۰۰ ئەمانە تەنها لەم ڕووەوە خاوەن ڕێزن كە زانان‌و جێگەی پرس‌و ڕای دەوڵەتن ۰

كاتێ ئیسلام هات‌و یاسای دامەزران (چەو مێژەر) لە (دیوان)دا نەبوو ، واتە كە ئیسلام هات‌و یاساكانی خۆی دانا‌و تایبەتیی نەكردن بە كۆمەڵێكی دیاریی كراوەوە ناو بنرێن (رجال الدین)و ئیتر ئایین هەر هیی ئەوان بێت‌و بە ئارەزووی خۆیان چی ئەكەن بیكەن ۰۰! وە مەردم لە دوورەوە ڕاوەستێ‌و نۆكەریی ئەوان بكات ۰۰!! ۰

بەلام ئەوەندە هەیە لەم ڕووەوە كە مرۆڤ ئەبێ پەلامار بداتە پێویستییەكانی ژیان هەریەكە لەسووچێكییەوە، خۆ ناگرێ‌و دەست نادات كە

تەنها مرۆڤێك بە باشی ئەندازەو پزیشكیی‌و یاسادانان شارەزابێت ، جا لەبەر ئەوە كاروباری ئەنـدازە درایە دەست ئەندازیار ، ئیش‌وكاری پزیشـكیی درایە دەست پزیشـك ٠٠ یاسادانانیش درایـە دەست ئـەو كەسانەوە شـارەزابن لە قورئـان‌و فەرمـوودەكانی پێغەمبـەرا ـ صلى‌الله علیـه وسـلم ـ وە هـەروەها جۆرەكانی‌تری ژیان ٠٠!

لە بیروڕای ئایینی پیرۆزی ئیسلاما نییە ، وە لە یاساو رژێمیشیا نی‌یە كە زانیاریی‌و تیورەكانی بەرهەڵست بكرێن ٠٠ چونكە سەراسەری مێژوو ئاگادارە كە تا ئێستا هیچ زانایەك سزا نەدراوەو نەسـووتێنراوە لەبەر ئەوەی تیورێكی زانیاریی خستبێتە ڕوو ٠٠! ٠

بۆیە ئـەو هەموو زاناو بلیمەتانەی تیـا هەڵكەوتووە نمـوونەی «ڕازی»و «ابن سینا» و «ئەبووبەكری خوارەزمی» و «جابیـری كوڕی حەیان» و «حەسەنی كوڕی هەیثـەم» و «ابن خەلدوون»و سـەدانی‌تر ، كە ڕێگەیان بۆ خەڵـك ڕۆشن كردەوە لە كاتێـكا «ئەورووپاو ئەمـەریكا» لە نەفـامی‌ی‌و نـەزانیی‌و وەحشی‌یەتا ئەژیان !! وە هەروەها كتێبخانەكانی «بەغداو قرطبەو قاهیرەو نیسابوور» كە بە هەزاردەها كتێبیـان تێدابـوو ـ شـایەتی سەربەسـتیی بیری ئیسـلامن ! وە شایەتی‌چـالاكیی‌و لێهاتوویی قوتـابی‌یەكانی قورئـانن ٠٠ لە كاتێكا بـوو ، نە ووزەی كارەبا بوو نە ئامێری چاپـەمەنی‌ی ٠٠! لە كاتێكا بوو ئەورووپـا هێشتای نەیئەزانی نووسین‌و خوێندنەوە چی‌یە ٠٠؟! ٠

نووسـینەكانی «ابن حزم» كـە چوارصەد بـەرگ بـوو ، وە كتێبەكانی «عبدالملیك‌ی كوڕی حەبیب» لە ئەندەلوسا ـ كە ئەگەیشتە هەزار كتێب ٠٠! ئایا ئەمانە نیشانەی ئازادیی بیرو ژیریی نین ٠٠؟ ٠

تەنها «ئەندەلووس» «٧٠» کتێبخانەی گەورەی تێدابوو ٠٠ ئیتر بێجگە لە مزگەوتەکان کە بە سەدەها کتێبیان تیا دائەنرا بۆ قوتابی هەژارو بێدەست !!

ئەوەیشمان لەبیر نەچێت کە موسڵمانەکان ، واتە خاوەن کتێبخانەکان دوای مردنی خۆیان کتێبەکانیان «وەقف» ئەکرد لەسەر قوتابیان وەك :ـ

«قاسیمی کوڕی سعدان» ـ کە لە ساڵی (٣٤٧)ی کۆچیدا دنیای بەجێهێشت وە چەندەهای تر لە دۆستانی زانستو زانیاریی ٠

موسڵمانەکان زۆر سەربەست بوون لە داهێنانی جۆراوجۆری زانیارییدا ـ بە پیاوو ئافرەتەوە ـ تەنانەت ئافرەت ئەوەندە ئازاد بوو تەنها لە «قرطبە»دا (١٧٠) کەسیان قورئانیان ئەنووسییەوە بە شێوەی «کووفی» ٠٠! ٠

ئەمەیە سەربەستیی ژیریی لە ئیسلاما بەو جۆرەو «مەطران»ی(١) خوا نەناسیش بەمجۆرە ئەکات کە ئەیکات :

ساڵی ١٩٤٩ی زایینی بڕیاریدا لە (اسپانیا)دا کە هەرچی کتێب هەیە لە کتێبخانەکانیا ـ واتە دوای نەمانی حوکمی ئیسلام لە ئەندەلووسدا ـ کە لە گەورەترین گۆڕەپانەکانی (غرناطە)دا کۆبکرێنەوە ٠٠ بەڵێ خەڵکی نەفام گورج هەڵسان بەدەم بانگەوازەکەیەوە ، وە بە پێی دەسەڵات کتێب کۆکرایەوە لە (باب الرملة)دا دەستی کرد بە کتێب سووتاندن ، وە بۆ ئەم ئیشەیش کە سەرکەوتوو بوو تیایا ئاهەنگێکی قورسی گێڕا ٠٠! وە لە چەندەها شوێنیتردا ـ هەر لە (ئەندەلووس) ئاهەنگ گێڕراو کتێب سووتێنران ٠٠!! ٠

هەندێ کەس ئەڵێت : یاسای ئیسلام (خودسەریی ـ دکتاتۆری)یە !! چونکە دەوڵەت ـ بە پێی تێنەگەیشتنی ئەوان ـ دەسەڵاتێکی بێسنووری هەیە ،

---

(١) مطران خمنیس دی سنیدوس چاودێریکەری کەنشتەی ئیسپانیا بوو !!٠

لەژێر ئەم پەردەدا هەرچی بێت بە خەیاڵیا ئەیکات ۰۰! وە پتر لەمەیش ئەڕۆن‌و ئەڵێن : دەوڵەت مرۆڤەکانی کردووە بە(بەندە) بەناوی ئاینەوە وە هەر یاسایەکی بڕیاردا بەسەر کۆمەڵدا ئەیکات ۰۰ ئیتر بێ بیرکردنەوە لە مافیان ۰۰!! ئا بەم جۆرە سەربەستیی بیروڕایان ئەمرێنێ‌و هەرکەسیش سەرپێچی بکات‌و لە یاسا دەرچێ سزای جۆراوجۆری ئەدات ۰۰ چونکە لە ئاین دەرچووە ۰۰!! ۰

ئێمەیش ئەڵێین ئاخۆ ئەمانە ئەم ووشە پووچەڵ‌و بێ‌ناوەرۆکانەیان لە چی‌یەوە وەرگرتبێت ؟! وا وەك «تووتی» هەر ئەیلێن‌و ئەیلێنەوە ۰۰ تۆ بلێی خودسەری‌ی‌و دکتاتۆری‌یەتی ئیسلامیان لەم ئایەتانەوە وەرگرتبێت :

«وأمرهم شورى بينهم ۰۰» ، «وشاورهم في الامر» ، «واذا حكمتم بين الناس ان تحكموا بالعدل ۰۰» ۰

یا لە وتارە بەنرخەکەی خەلیفەی یەکەمەوە (ئەبو بەکر) ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ کاتێ لە (میحراب)دا دانیشتووەو خەیاڵ‌و بیرو هۆشی‌و ڕامیاریی خۆی دەرئەبڕی لەبەردەم جەماوەرێکی زۆردا ، دوای ئەوەی جڵەوی حوکمی کەوتە دەست؟! ۰

«خەڵکینە بزانن ، من چاودێریکەرو شوانی ئێوەم ، وە ئەوەیش بزانن لە ئێوە باشتر نیم ۰۰! ئەگەر ڕێگەی چاکەم دایەبەر یارمەتیم بدەن ، خۆ ئەگەر لامدا ڕاستم بکەنەوە ۰۰۰۰۰ هەتا فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەر بووم ، ئێوەش گوێ‌ڕایەڵم بن ، خۆ ئەگەر سەرپێچییم‌کرد نابێ بەگوێم بکەن ۰۰» ۰

وە یا لە وتەی خەلیفەی دووەمەوە (عومەر) خوا لێی ڕازی بێت ـ کاتێ ئەفەرمێ : «فان وجدتم في اعوجاجا فقوموه ۰۰» ئەگەر لاریتان لێ بەدی‌کردم ،

---

(۱) سورەتی الشورى ئایەتی (۳۸) واتە کاروباری موسڵمانەکان بە تەگبیرو ڕاوێژە ، نەك هەڕەمەکی‌و خودسەری‌ی ۰

کورج ڕاستی بکەنەوە ، ئینجا یەکێ لە موسامانەکان پێی ووت :

«بەخوا ‥ ئەگەر هەڵەیەکمان لێ بینیت بەشیر ڕاستت ئەکەینەوە ‥» !٠

لە ئیسلاما سەربەستیی وتەو راو بیرو ژیریی بێسنوورە ، بە مەرجێ ئە چوارچێوەی ئیسلام دەرنەچێت وەك لــە پێشەوە هەندێ لەم باسە دواین ٠ بەڵام سەربەستیی بۆ ستەمکارانو خوێنمژانو ناپاکەن نییە ‥ ئیسلام بستێك ناچێت بەسەریانا ، وە ملەملێیان لەگەڵ ئەکات هەتا ئەگەڕێنەوە بۆ لای قورئان ، وەك کاروانی شەهیدانی ئیسلام تۆوی ئازادییو ملەملێیان چاند لەگەڵ هەرکەسێکدا لە ئیسلام دەرچێتو دەرچــووبێت ، بۆ نموونە مامۆستای شــەهیدان «سەعیدی کوڕی جوبەیر» ــ خوا لێی ڕازیی بێت ــ ئەفەرمێ : (حەججاج) پێیوتم :

«چۆنت پێخۆشە ئاوا ئەتکوژم ‥» ! (واتە کوشتنت مسۆگەرە ، جا بڵێ ئاوا بمکوژە ‥!) ٠

خواناسو پشتشکێنی ستەمکاران (سەعید) فەرمووی بە (حەججاج) :

خۆت سەربەست بە ، سوێند بەخوا بەهەر جۆرو شێوازێك بمکوژی ، خوا بەو شێوەیە ئەتکوژێتەوە لە دوا ڕۆژا ! ٠

حەججاج ــ ئەتەوێ لێتخۆشبم ؟

سەعید ــ ئەگەر چاوپۆشیی ببێ لەلایەن خواوەیە ، ئەمما تۆی (ستەمکار) ڕزگارنابیت لە تۆڵەی دوارۆژ ٠

ــ ببەن بیکوژن ‥ !

کاتێ لە قاپییــەکە چووە دەرەوە پێــکەنیو زەردەخەنەیەکی کــرد ، ئینجا جەندرمەکان وتیان بە حەججاج شتێکیوا !

ــ بیگێڕنەوە بۆ لام ٠

ــ بۆچی پێکەنیت ‥؟!

ـ سەرم سوڕما لـە حیلمو حەوسەڵەی خوا بەرانبەر بە تـۆ ، وە لە زاتو جورئەتی تۆ لەسەرخوا ٠٠!

(ئامادەکرا بۆ کوشتنو) ووتی : بیکوژن !

سەعید ـ وجهت وجهي للذي فطر السموات والارض حنيفا مسلما وما انا من المشركين ٠

ـ بیخەن بە دەما !

سەعید ـ منها خلقناكم وفيها نعيدكم ومنها نخرجكم تارة اخرى ٠

ـ سەری برن ٠٠!

سەعید ـ بزانە من موسڵمانم ، ئەم شایەتەیش با لەلات بێت ، هەتا لەدوا ڕۆژا پێمئەگەیت ٠٠ «اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له ، وان محمدا عبده ورسوله ٠٠» ٠ دوای ئەمە مامۆستای شەهیدانو کۆڵنەدەر فەرمووی :

«خوایا زاڵی نەکـەی بەسـەر کەسیترا بیکـوژێ دوای من ٠٠» ! ئینجا لە کۆشکی تاوانکاریەوە بریاردراو سەریانبری !!(١) ٠

بەڵێ ٠٠ نزای پاکانو ڕاستان لای خوا گیرایە ٠٠ بۆیە (حەججاج) «خۆرە» دایە سکیو پزیشك هاتە سـەریو گۆشتێکی بۆگەنیکرد بە دەزوویـەکەوەو لە قوڕگییەوە گەیاندییە ناو سکیو پاشان دەریهێنایەوەو خوێنی پێوەبوو ، بۆی دەرکەوت کە ئیتر ناژیو لە دەست دەرچووە(٢) ٠٠ دوای ئەوە (حەججاج) (١٥) پانزە شەو ما ، وە لەسەریەكو بێوچان ئەیزیرانو ئەیوت : بۆ سەعید وائەكاتو وازم لێناهێنێ ، هەرکات ئەخەوم قاچم ڕائەکێشێ ٠٠!! ٠

---

(١) گۆڕی خوالێخۆشبوو وا لە «واسط»ی عێراقدا ٠

(٢) الاكمال في اسماء الرجال للامام التبريزى ٠

ئەمەیش جۆرە تاقیکردنەوەیەك بووە لەو سەردەمەدا ، وەك ئێستا ئامێری ئەخەنە گەدەوە لە قوڕگەوە ٠

بەڵێ ٠٠٠ هەندێکەس ئەڵێن : ئیسلام مافی ئادەمیزادی نەداوە ٠٠!!

لە وەڵامی ئەوانەدا تەنها ئەم پرسیارە بەسە : ئایا موسڵمانەکانی ( چین) مافیان هەیە ٠٠٠ ؟ موسڵمانەکانی (ڕووس‌و هیند) مافیان هەیە ٠٠؟ ئایا فیکرەو بیری موسڵمانـەکان تەطبیق ئەکـرێ ٠٠؟ یـا فیکرەی مارکسی‌یـەت لە دەوڵەتە شیوعی‌یەکاندا‌و فیکرەی سەرمایەداری‌ی لە دەوڵەتە سەرمایەدارەکانا ٠٠٠؟! ٠

ئەی ئایا موسڵمانەکانی (کەمبوچیا ـ کمبودیا) کە لە ١٠٪ی دانیشتوانی کەمبووچیا ئەگرنەوە ٠٠ ماف‌و ئازادی‌یان هەیە ٠٠؟!

یاخود گیرۆدەی دەستی «شیوعی‌یەکان»ی (فنوم پینە)ن‌و بە چەندەها شێوەو شێواز ئازارو ئەشکەنجە ئەدرێن ، بەتایبـەت ساڵەکانی ١٩٧٠ـ١٩٧٥ ئەمەیش نموونەیەکیەتی :ـ

١ ـ زاناو داناو پێشەواو فەرماندەکانیان لە سێدارەدان ٠٠! ٠

٢ ـ قوتابخانە ئایینی‌یەکانیان وێرانکردن ٠

٣ ـ مزگەوت‌و شـوێنە پیرۆزەکانی‌تریـان کرد بـە «سایلۆ»و گەلەخانەو تەویلەی بەراز ٠

٤ ـ قورئان‌و هەر کتێبێکی‌تری ئایینی‌یان بوو سووتانیان ٠

٥ ـ نەیانهێشت هیچ دروشمێکی ئایینی بەکار بێنن ٠

٦ ـ بە زۆر گۆشتی بەرازیان دەرخواردی موسڵمانەکاندا ٠

٧ ـ کچۆڵە کۆرپەکانیان ـ ئەوانەیان تەمەنیان ٦ـ٧ ساڵ بوو ـ ئەفڕاندو ئارەزووی بۆگەنیان پێ تێر ئەکردن ٠٠ وە هەروەها ٠

ئایا ئەمانە سەربەستی‌ی ئادەمیزادیان تیایە ٠٠٠؟

وەیا هەر مانای سەربەستی‌ی ئەزانن ٠٠؟!

بەڵێ ٠٠ لە زۆر جێگادا هەژارو چینی چەوساوە مافو پاشەڕۆژی پێشێل کراوە بە ناوی (ئایینەوە) ! بەڵام کێ ئەڵێت ئەو پەردەی «ستەمە» کە تاوانباران کێشاویانە بە ڕووی خۆیاندا ، وە لە ژێریەوە چەندەها هەژار لەناو ئەبەن ، کێ ئەڵێت ئەو پەردە تەنها «ئایینە» ؟ ٠

ئایا (هتلر) بە ناوی ئایینەوە بوو ئەوەی کە کردی ٠٠ یا (فرانکۆ ٠٠) ؟! زۆرجار هەژار پاشەڕۆژی وونکراوەو پێشێل ئەکرێ بەناوی «ئایینەوە» ! یا بەو ناوەوە «یاسا وا ئەڵێتو ٠٠ وا ئەڵێت» دەی ئایا چارەسەری ئەم دەردە ئەوەیە کە ئایینو یاسا هەڵوەشێنینەوە ٠٠؟ تا بەشکوم سەربەستیی «بیرو ژیـریی» بە دەست بێت ٠٠ بەڵێ ٠٠ هەر ئاینێك مرۆڤ پێشێل بکاتو زەوتی ئازادیی لێ بکات ئەبێ بە زووترین کات لەناو ببرێت ، وە هەوڵ بدرێ بۆ لەناوبردنی ٠

دەی ئایا ئیسلامیش یەکێکە لەو ئایینانە کە خەڵکی چەوسانووەتەوەو سەربەستیی لێ زەوت کردوون ٠٠؟ ٠٠ نەخێر ٠٠ بەڵکو ئیسلام لەبەر خاتری ڕزگار کردنی گرۆی ئادەمیزاد هات ٠ لە زوڵمو ستەم ٠



# چارەســــــەرێك

چارەسەری ئەم سەرگەردانیی‌و پشێویی‌و بەرەڵایی‌و ماف پێشێل کردنە ئەوەیە کە : کۆمەڵێکی موسڵمان‌و خاوەن بروا بـە «دوارۆژ»و پاشەڕۆژ دروست بکرێ ، بۆ ئەوەی ڕێزی سەربەستیی بگرێت‌و دەسی تاوانباران ببرێت ‥ ئیتر ئەو کاتە هەژار دیل‌و ژێردەست ناکرێت ٠ چونکە هەوڵ‌و تەقالای ئیسلام هەمیو کات ئەوەبووە کە : گەلێکی شارەزاو ڕۆشنبیرو زاناو داناو هەڵکەوتوو دروست بکات ، تا لە ستەمی ستەمکاران ئاگاداریان بکات‌و ڕیشەکەنیان بکەن ‥ هەوڵ‌و کۆششی ئیسلام ئەمە بووە ‥ نەك بەنج‌کردن‌و هەست مراندنیان‌و نەهێڵی سەر بێننە ڕۆشنایی ‥! بۆ ئەوەی هەر ژێردەستە بن‌و هەست بە مافی خۆیان نەکەن ـ وەك توانج‌گرەکان ئەڵێن ! ـ چونکە هەرچـەندە سەیری فەرموودەی قورئان‌و وتە بەنرخەکانی پێغەمبەرمان ـ صلى الله عليه وسلم ـ ئەکەین ئەبینین بە «کرداری فەرمان» داوای ووردبوونەوە ئەکات لە یاسای بوونەوەر ‥ «قل انظروا ماذا في السموات والارض» ٠ وورد ببنەوەو بزانن چی‌بەدی ئەکەن لەیاسای ئاسمانەکان‌و زەوییـدا ‥؟ وورد ببنـەوە بـە چـاوو بیـرو هـۆش ‥ بـە «تەلیسـکۆب‌و میکرۆسکۆب» ٠ واتـە دەستەوسان دامەنیشن لەبـەردەم یاسای بوونـەوەردا ، بەڵکو کۆشش بکەن‌و پێی بگەن ٠

«ان في خلق السموات والارض واختلاف الليل والنهار لايات لأولى الالباب الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم ويتفكرون في خلق السموات والارض ربنا ما خلقت هذا باطلا سبحانك فقنا عذاب النار ‥» ٠ سورەی ال‌عمران/ ١٩٠ـ ١٩١ ٠

ئایینێك مرۆڤ هەڵنێت بۆ ووردبوونەوە لە یاسای بوونەوەر ‥ ئایینێك بڵێـت : «لا عبـادة كالتفكيـر» هیـــچ جـۆرە خواپەرستی‌یـەك ناگاتە پلـەی (بیرکردنەوە) ‥! ٠

ئایینێك هەرەشە بكات لەو كەسانەی بــە رەش‌كوێریی بەسەر بوونەوەردا هەنگاو ئەنێن ، نەك تەنها هەر ئەمە بەڵكو سزایان بدات :

«ولقد ذرأنا لجهنــم كثيرا من الجن والانس لهم قلوب لا يفقهــون بها ولهم آذان لا يسمعون بها ولهم أعين لا يبصرون بها أولئك كالأنعام بل هم أضل ، أولئك هم الغافلون ٠٠» سورة الاعراف/١٧٩ ٠

ئایینێك تا بەو جۆرە بێت ٠٠ ئیتر رەوای حەقە بەو ئایینە بووترێ : «بیری مرۆڤی خستووەتە ناو ئەشكەنجەو گووشیویەتی ٠٠ ؟ » ٠

ئیسلام زۆر دژی لاسایی‌و دواكەوتنــە ، وە زۆر رقی لەو كەسانەیە كە بە دووربینی راســتەقینە ســەیری بوونەوەر نــاكەن ، وە بــە ووردیی تەماشای ناكەن ٠٠

«أفلم ينظروا الى السـماء فوقهــم كيف بنيناهــا وزيناها ومالهــا من فروج والارض مددناها والقينا فيها رواسي وانبتنا فيها من كل زوج بهيج تبصرة وذكرى لكل عبد منيب» ق/٦ ، ٧ ، ٨ ٠

«ألم تر أن الله أنزل من السماء ماء فاخرجنا به ثمرات مختلفا ألوانها ، ومن الجبال جدد بيض وحمــر مختلف ألوانهــا وغرابيب ســود ومن النــاس والدواب والانعام مختلف الوانه كذلك انما يخشى الله من عباده العلماء ٠٠» ٠ سورة فاطر/ ٢٦ ، ٢٧ ٠

ئیسلام سەربەستیی تیایە لە هەمــوو بووارەكانی ژیاندا ــ بەوپەڕی مانای وشەوە ــ سا مەگەر شتێك زیانبەخش بێت بۆ خۆی ، یا بۆ كۆمەڵ ٠٠ ئەوكاتە ئیسلام دەســتی ئەگرێتو بەرەڵــلای ناكات تا بــە ئارەزووی خــۆی چی ئەكات بیكات ٠٠! چونكە ئادەمیزاد لەم كاتەدا دواكەوتووی ئارەزوویەتی ، رابواردن چاوی كوێر كردووە ، هیچ هەستناكات بە چاكو خراپ ، بەڵكو زۆر جار وا ئەبێ

تاكو كۆمەڵ ئەكا بە قوربانیی لە پێناوی بەجێهێنانی ئارەزوو مەبەستیدا ٠

ئاشكرایە كە ئـەم جۆرە كردەوانـە هەڵـەو نـارەوان ، ئەی چـۆن ئەبێت خێزانێك بكەونە تاڵیی ژیانەوە لەبەر خاتری ڕابواردنی ئەو ٠٠؟! چۆن ئەبێت بنەماڵەیەك ڕیسوا ببێت لە پێناوی دڵو دەروونی نەخۆشی ئەودا ٠٠؟!

## زیانەكانی عەرەقو بیرە

بەڵێ ٠٠ ئیسلام ئـازادیی نەداوە بـە «ئادەمیـزاد» بۆ «عـەرەقو بیرە» خواردنەوە ، بەڵكو یاساغی كردوون لێی ، چونكە پڕن لە زەرەرو زیانی گیانیو دەروونی ٠

وە زۆریش سوپاسی خوای گەورە ئەكەین كە زانیاریی چەرخی بیستەمی پێ بەخشیوین ، چونكە بە تەواویی زەرەرو زیانـەكانی عەرەقی ڕوون كردەوە بۆمان ، وە ئەگەر ئێمە بمانەوێت بڵێین : «عەرەق» ، گەورەترین هۆیە بۆ تێكشكاندنی كۆئەندامی هـەرس كردنو نەهێشتنی ئـارەزووی خواردنو نەخـۆشیی جگەرو بریندار بوونی گەدەو ڕیخۆڵە ، وە تێكدانی سوڕی خوێن ، وە هەروەها ئەبێتە هۆی مـردنی كتووپـڕیی كە پـێی ئەڵێن (جلطـة القلب) ، وە هێلـكەی زاوزێ زەبوونو لاواز ئـەكات ، وە پلـەی ژیریی دائەبـەزێنێ ، وە كۆئەنـدامی دەمار ئەپسێنێ ٠٠ هـەروەك زۆرجاریش عەرەقخـۆر شێتو هـار ئەبێت ٠٠!! وەیا تووشی لەرزین ـ شلل ـ ئەبێت ٠٠٠ وە هەروەها ٠٠

خۆ ئەگەر ئێمە ئەمەمان بووتایە پڕ بەدەم جاڕی كۆنەپەرستییو نەزانینیان بۆ ئەدایین ٠ سوپاسی دكتـۆر (كلیوجی)ی ئەمەریـكییو دكتـۆر (جۆنسۆن)ی ئینگلیزییو ٠٠٠ هتد ئەكەین سەبارەت بـەو جارەی دایان بە دنیادا لە بارەی پیسییو زیانی عەرەقەوە ٠

ئەگەر تەماشای زیانەکانی (بیرە)یش بکەین نابینین کەمتر نییە لە عەرەق هەرچەند زۆرکەس ئەیخواتەوە بە ناوی نەخۆشیی گورچیلەوە ، وەیا بۆ قەڵەویی، پێم‌خۆشە خۆت تەماشای گۆڤاری(طبیب‌معك)ە بکەیت، ل۹۷ـ۹۸، ژ۸، لە نووسینی دکتۆر (صبری القبانی)ی ، وە لەژێر سەردێری : (البیرة اشد المسكرات ضررا) • واتە بیرە لە هەموو جۆرە عەرەقەکان زیانی زیاترە ۰۰۰!! وە هەروەها لە کتێبی «الفقه علی المذاهب الاربعه» لاپەڕە (٤٢)و بەرگی پێنجەم‌و چاپی یەکەم‌دا هاتووەو ئەڵێت :

پرۆفیسۆر (ایت موترین) بەڕێوەبەری زانکۆی «لاما» لە «کەنەدا» دەری‌بڕی لەو کۆنگرەیەدا کە بەسرا لە (لەندەن) سەبارەت بەنەخۆشی‌یەکانی دڵ، دەری‌بڕی ووتی : دوای لێکۆڵینەوە لە (٤٨) پیاوو دوو ئافرەت کە تووشی نەخۆشی‌یەك بوون وەك (بری‌بری)ی وایە ، دەرکەوت هۆی تووش‌بوونیان خواردنەوەی «بیرە»یە •!

بە کورتیی :

عەرەق قەدەغەیە لە ئیسلاما بە هەموو جۆرەکانیەوە ، ئیتر هەر ناوێکی بێ وەك : «بیرە ، ویسکی ، شمپانیا ، کونیاك ، فودکا ، روم ۰۰۰ هتد» ۰۰ چونکە پێغەمبەر ـ صلی‌الله علیه وسلم ـ ئەفەرمێ : «کل مسکر خمر وکل خمر حرام ۰۰» یا ئەفەرمێ : «کل شراب اسکر فهو حرام ۰۰» بوخاری‌و موسلیم •

کارەسات‌و ڕووداوی عەرەق خواردنەوە ـ چ تەندروستیی ، چ دارایی ـ لەوانە نییە بە ڕێکی تۆمار بکرێ !! گوێ‌بگرە بۆ ڕاپۆرتێك چی‌ئەڵێت : «کارەسات‌و ڕووداوی ساڵی ۱۹۷٦ بەهۆی عەرەق خواردنەوەوە گەیشتە (۲۳٦۹) ڕووداو ، ئەمە تەنها ئەو ڕووداوانەن کە تۆمار کراون ۰۰!! ئیتر خوا ئەزانێ چی‌تر بووبێت ۰۰» بۆیە پزیشکەکانیش ئەڵێن : خواردنەوەی ویسکی بە ئەندازەی (فنجانێکی قاوە) کە ئەکاتە (۳۰ سیس) ئەبێتە هۆی بەرگریی کردن لە لێخوڕینی ئۆتۆمۆبیل •

زانا ئابووری‌یەکانیش ئەڵێن : هەر درەمێك خەرج بکرێ لە پێناوی سوودو قازانجی وولاتدا ئـەوە مایەی سـەرفرازیی‌و سەرکەوتنـە بۆمان ، بـەڵام هەر درەمێك سەرف بکرێ لـە زەرەرو زیانمانـدا •• ئەوە ئەبێتە زیان بـۆ خۆمان‌و نیشتمانیشمان •• جا ئیتر زیانی ئەو ملیۆنەها لیرانە لە کوێ کە لە ڕێی عەرەق خواردنەوەدا لەناو ئەبرێن ••؟!

زانا کۆمەڵایەتی‌یەکانیش ئەڵێن :

لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ لەوپەڕی بەختیاریی‌و ئاسایشدا بژی ، نابێ نزیکی شتێ بکەوێتەوە کە ببێ بە مایەی پشێویی‌و ئاژاوەی وولات •

بەڵێ •• ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەو جۆرە شتانەدا ئادەمیزادی سەربەست نەکردووە ، بۆیە بە ئایینی کۆنەپەرستیی‌و دژی پێشکەوتن خوازان ناو ئەبرێ لای هەندێ کەس ! •

بێگومانە لەوەدا کە ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر ڕێکوپێکەو شیاوی هەموو شوێن‌و جێـگاو کاتێکە ، بۆیە ئەوانیش بڕوایان پێی نییە هەر ڕۆژە لـە دوای ڕۆژ ئەگەڕێنەوە سەر ئەو یاسایانە ئەو دایناون ، بۆ نموونە : دەوڵەتی ئەمەریکا دەوڵەتێکی پێشکەوتـووەو عەرەقی بـەلاوە ڕەوایـە •• بـەڵام کاتێ زیانەکانی عەرەقی بۆ دەرکەوت بە گورجی‌ی پەلاماری‌دا بۆ یاساغ کردنی بە چەندەها جۆرو شێواز •• جارێ بە نووسین لە پەڕاوەکاندا ، جارێ لە گۆڤارەکاندا ، جارێ‌تر بە (محاضرە) لەسەر فلیمی سینەماکاندا •• وە هەروەها •• زاناکانی ئەڵێن : ئەوداراییەی ئەمەریکا سەرفی‌کرد بۆبڵاوکردنەوەی چاووڕاو لەدژی عەرەقداپترل (٦٠) ملیۆن دۆلار بـوو ••!! (١٠) بلیـۆن لاپەڕەی بـڵاوکردەوە بـە گۆڤارو ڕۆژنامەو شتیوا ••! ئـەم کارەی (١٤) ساڵی خایاند •• لەو ماوەیـەدا «٣٠٠» کەس درا لە قەنارە ، وە (٥٣٥ر٣٣٥) کـەس کرایە بەندیخانەکان ، وە زەرەرو

زيان گەيشتە (١٦) مليۆن جنيهى ميسرى • بـايى «٤٠٤» مليۆن جنيـە سامان دەستى بەسەرا گيـرا (مصادرە) • لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵەدا هيـچ ئەنجامێكى دەست نەكـەوت ، ناچار بوو لە ساڵى «١٩٣٣»دا ئەو ياسايـە هەڵوەشێنێتەوەو خەڵكەكە بەرەڵلا بكاتەوە •

زەرەرو زيانى عەرەق بەمن و تۆ نانووسرێ و تەواو نابێت ، جا لەبەر ئەوە پێنووس هەڵئەگـرين ، بەڵكو تۆى بەرێزيش تەماشـاى برێ كتێب بـكەى لەم بارەيەوە ، وەك ( الخطايا في نظر الاسلام ، ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين ، روح الدين الاسلامى •••) وە هەروەها •

## ئيسلام سەربەستى تيايە بەڵام نەك بۆ شەرواڵ پيسـىو بـەرەڵلايى

بەڵێ •• ئيسـلام ئادەميزادى ئازاد نەكردووە بە ئارەزووى خـۆى لەگەڵ يەكتـرا رابوێـرن بێ ئـەوەى ياسـاى ژن و مێـرديى جێبەجێ بـكەن ، چونكە سەربەستيى بەو جۆرە دەردى كوشندەى كۆمەڵە ••! بەس خۆزگە ئەوەى پزيشك ئەيزانى نەخـۆشيش بيزانيايـە •• زۆر خواردەمـەنىى ناياب هەيـە پزيشك قەدەغەى ئەكات لـە نەخۆش ، كەچى زۆرجـار چاوى بەو خواردنـە ئەكەوێت و حەزى لێئەكات و دكتۆرەكە ناهێڵێ تامى بكات •• ئينجا دەست ئەكات بە هێرش بردنە سەر پزيشكەكە ، وائەزانێ گزيى و خەيـانەتى لێكراوە ، وەيا بە هەڵەدا چووە ، يا هەر نەزانە بۆيە ئەو خواردنەى لێ قەدەغە كردووە ••!! تێكەڵاويى كچ و كوڕ چەندان دەردى ژەهـراويى لێئەبێتەوە ـ وەك لە سەربەسـتىى جل و بەرگدا هەندێـكمان ووت لەم بارەيـەوە ـ بۆيـە ئيسـلام ياسـاغى كردووە لە موسڵمانەكان بەڵام ـ بـە داخەوە ـ ئـادەميزادى بەدبـەخت زۆربـەى وەك ئەو نەخۆشە وايە هەست بە چاك و خراپ ناكات •

جا فەرموو بەیەکەوە سووڕێکی مێژووی ئەو گەلانە بدەین کە (ئازاد بوون لە کۆتو زنجیری ئایـین ۰۰!!) ئەوجا بۆت دەرئـەکەوێ کە هـۆی ڕووخاندنی شارستانی‌یەتی وولاتـە پێشووەکان بەرەڵـلایی‌و (سێکس)یەت بـووە ۰ مێژوو شایەتە بۆ ڕووخاندنی (ئیغریقی)یەکانو (ڕۆمان)و (فارس)ەکان بەهۆی شەرواڵ پیسیی‌و تێکەڵاوی‌یەوە ۰۰!! ۰

فەرەنسەیش ئەوەندە خەریکی مەسەلەی (سێکس)یەت بوو ، تا لە ئەنجامدا هەموو لەشیان داهێزراو لاواز بوونو بەرەو ڕووخاندن ملیان نا ، وە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەمارەکانی لەشیان بێ‌هێزبوو ، ئارەزوو هەواو هەوەس ئارامی لێ‌بڕین ۰ ئینجا لە هەموو لایەکەوە نەخۆشیی هروشمی بۆ هێنان ، وە تەندروستی‌یان لەق بوو ۰۰! تەندروستییش نەمێنێ سەرباز جەنگی پێ‌ناکرێ ۰ تەنانەت لەسەرەتای سەدەی بیستەمیشەوە ئامیـر هێزەکان هەر لە لاواز بووندا بـوون ۰۰! وە ئەو ئەندازە لەشکرە کە پێویست بوو بۆ پاراستنی وولات زۆرجار دەست نەئەکەوت لەبەر بێ‌کەڵکی‌ی گەمەلەکەیان ۰۰!!

هەر لەمەوە بوو کە لـە دوای جەنگی یـەکەمی گشتی‌ی جیهانییـدا (۷۵) هەزار کەسی عەفـووکرد لە سـەربازیی‌و ناردنی بـۆ نەخۆشخانـەکان ، چونکە تـووشی نەخـۆشیی سـووزەنەك (زوهـــەری) بووبـــوون ۰۰!! ئەمـــەیش لـە ئەنجـامی تێـکەڵ بـوونی کـــچو کـــوڕو لێ‌نەپرسـینەوەیان ۰ دکتـۆر (لیریـە)ی فەرەنسـیی ئەڵێت (۳۰) هـەزار کـەس مـردن بەهـۆی نەخـۆشیی سوزەنەکەوە ۰۰!!

وە لە ساڵی (۱۹٦۲)دا لە ئەمەریکا سەرژمێری‌یەك کرا لەو سەرژمێری‌یەدا بۆیان دەرکەوت کە لە (۷) کەس (٦)یان کەڵکی سەربازی‌یان پێوە نییە ۰۰!!

بـە کـورتیی : شـەرواڵ پیسـیی‌و تێـکەڵی‌ی کـچو کـوڕ مەتـرسی‌ی سەرگەردانیی‌و پشێویی‌و سووزەنەكو (سەیلان)ی لێ‌ئەکرێ کە دوو نەخۆشی‌ی مەترسی‌ی لێکراون ، جا بـۆ متمانەو بۆ ئەوەی ئەم ووتانە باشـتر بڕۆن بە دڵتا فەرموو تۆزو نەخشـەیەك کە سـاڵی ۱۹٦۵ ڕێکخـراوی تەندروسـتیی گشتیی

(منظمة الصحة العالية) بلاوى كردوه ڕێژەی ئەوانە ئەخاتە پێشچاو کە تووشی نەخۆشیی سووزەنەکو (سیلان) بوون :ـ

ڕێژەی نەخۆشییەکانی (زوهەریو سەیلان) لە وولاتە یەکگرتووەکان
ساڵی ١٩٥٦ـ١٩٦٢ بە پێی تەمەنو دیاریکردن بەم شێوەیە

| ٠ـ٩ | زوهەری | سەیلان | ١٠ـ١٤ ساڵ زوهەری | سەیلان |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٥٦ | ١١ | ١ر٢٢٢ | ٧٥ | ٢ر٤٢٥ |
| ١٩٥٧ | ٣٣ | ١ر٦٢٨ | ٨٠ | ٢ر٣٦٣ |
| ١٩٥٨ | ٢٣ | ١ر١٦٤ | ٩٠ | ٢ر٧٠٦ |
| ١٩٥٩ | ٣٩ | ١ر٣٢٨ | ١٠٩ | ٢ر٦٠٠ |
| ١٩٦٠ | ٢٠ | ١ر٦١٩ | ١٣٩ | ٣ر٢٦١ |
| ١٩٦١ | ٣٥ | ١ر٦١٥ | ٢١٠ | ٢ر٥٦٧ |
| ١٩٦٢ | ٤٠ | ١ر٤٥٩ | ٢٢٥ | ٢ر٤٢٢ |
| ١٩٥٦ | ٤٠ | ١ر٤٥٩ | ٢٢٥ | ٢ر٤٢٢ |
| ١٩٥٦ | ١ر٠٩٣ | ٤٤ر٢٦٤ | ١ر٧٧٨ | ٧٤ر٧٥٥ |
| ١٩٥٧ | ١ر١٩٢ | ٤٣ر٧٠٥ | ١ر٨٥٧ | ٧٠ر٧٧٧ |
| ١٩٥٨ | ١ر٢٢٨ | ٤٨ر٧٢٣ | ٢ر٠٠٥ | ٧٦ر٩٦٤ |
| ١٩٥٩ | ١ر٦٦٨ | ٥٠ر٣٢٤ | ٢ر٧٧٩ | ٨١ر٠٧٦ |
| ١٩٦٠ | ٢ر٥٧٧ | ٥٣ر٦٤٩ | ٤ر٦٩٢ | ٨٧ر٨٢٣ |
| ١٩٦١ | ٣ر٢١٥ | ٥٢ر١٣٠ | ٥ر٥٧٥ | ٩٠ر٦٨٦ |
| ١٩٦٢ | ٣ر٥٨٧ | ٥١ر٦٧٩ | ٦ر٠٦٣ | ٩١ر٥٨٨ |

«ولا تقربوا الزنا انه كان فاحشة وساء سبيلا» • الاسراء •
صدق الله العظيم •

# داخوازی لاشەیی‌و نـەژادی «الغریزة الجنسیة»

ئادەمیزاد لای ئیسـلام زۆر خاوەن ڕێزە ، بۆیە هەرشـتێك یاسای ژیانی ئاسایی لێبگۆڕێ خێرا دەست ئەگرێ بەسەریاو قەدەغەی ئەکات لێی ، نەوەك تووشی زیان ببێ ، گیانیی ، یا دەروونیی ٠

کاتێ ئیسلام ئەڵێت :

کچ‌و کوڕ تێکەڵ نـەبن هەنـدێکەس ئەڵێـن : سـەربەستیی نەداوە بە ئادەمیزاد ، وە هەسـتی دەروونیی تاسانـدووەو کپ (کبت) کـردووە !! واتە بەرگریی کراوە لە ئارەزووی (سێکس)یەت !

جا باش وایـە پێش ئـەوەی بزانـین کێشی ئـەم وتەیە (کبت) چەنـدە لە ئیسلاما مانایەکی ڕێكوپێـکی وشەی (کبت) وەرگریـن بە دەم بـاوەڕ پێکراوی هەندێ کەسەوە (فرۆید) !! ٠

فرۆید ئەڵێت : کبت ئەوەیە : هێزی (سێکس)یەت بە شتێکی خراپ بدرێتە قەڵەم ٠ واتە هەموو ڕێگەیەکی بەجێهێنانی لێدابخرێت (چ ڕێگەی پەسەند ، چ ڕێگەی ناپەسەند) ٠

دەی ئایا ئیسلام بەرگری هێزیی ئارەزووی ڕابواردنی کردووە بە شێوەی پەسەندو ڕەوا ٠٠؟!

لە یاساکانی هەمـوو جیهاندا یاسایەکی‌تر نییە وەك ئایینی ئیسـلام دداں بنێت بە هاواری زگماکیی‌و غەریزەی (جینسی‌یەت)دا ٠ گوێ بگرە بۆ ئەم ئایەتە بزانە چی ئەفەرمێت :

«زین للناس حب الشهوات من النساء والبنین والقناطیر المقنطرة من الذهب والفضة والخیل المسومة والانعام والحرث ٠٠» ٠ سورة آل عمران/١٤ ٠

لەم ئایەتەدا هەرچی جوانیی‌و ئارەزوو هەیە کۆکراوەتەوەو پێی لێنراو، کە لە (واقع)دا هەیە ، وە رەونەقە بۆ مرۆڤ‌و هۆی بەدەست هێنانی ژیانی سەر زەوی‌یەو هیچ جێگەی رەخنە نییە ، وە هەرکەسیش هەست بکات بەم ئارەزووە ئیسلام سەرزەنشتی ناکات ، بە مەرجێ لە رێگەی پەسەند کراوی خۆیا جێبەجێ بکرێ .

ئەم فەرموودەی پێغەمبەرەیش ـ صلى‌الله علیه وسلم ـ ئەگەر دڵی بدەیتێ بۆت دەرئەکەوێ کە تـا چ پلەیەك لە ئیسلاما ددان نراوە بە داخـوازی لاشەیی‌و نەژادیی (الغریـزة الجنسیة)دا .. «یەکێ لە رەوشتەکانی من ژن هێنانـە ، هەر کەسێ لە رەوشتەکانی من لابداو پشتیان تێبکا لە ئێمە نییە» . واتە موسڵمان نییە . وە لە فەرموودەیەکی‌ترا ئەفەرموێ :

«هەتا گەنج ژن نەهێنێ نیوەی ئایینی دانامەزرێ ..» .

بێجگە لەمانـەیش .. گۆشەگیریی‌و خۆ دوور خستنەوە لـە ژن هێنان‌و لە شوو کردن ئیسلام هەڕەشەی لێکردووە : (هەرکەس ژن نەهێنێ موسڵمان نییە) .

وە ئەفەرمێ : (مرۆڤ پاداشی ئەوەی ئەدرێتەوە کە ئەچێتە لای هاوسەرەکەی خۆی ..) لەم فەرموودەیە موسڵمانەکان سەرسام مانو وتیان :

(چۆن ئـەی پێغەمبەری خوا .. ئەگەر یەکێکمان ئارەزووی خـۆی بەجێ بێنێ لای خوا پاداشی هەیە ..؟!

پێغەمبەر ـ صلى‌الله علیه وسلم ـ فەرمووی :

«پێم‌بڵێن ئەگەر ئەو ئاوە (نطفە) لە شوێنێکی حەراما دابکات گوناهی لەسەر نییە ..؟ دەی هەر بەو جۆرەیش ئەگەر لە جێگایەکی رەوادا دایکات پاداشی بۆ هەیە ..» . بە کورتیی :

ئایینی پیـرۆزی ئیسـلام خاوەنی هیـچ نەنگ‌و لەکەیـەك نییە لـە هیچ رووییەکدا .. تەنها ئەوە نەبێت کە لەگەڵ سروشتی ئەوانەدا کە رۆژئاواو رۆژ

هەڵات دەستەمۆی کردوون ناگونجێت ۰۰!! چونکە ئەوانە «ڕەوشتیان تێکچووە ، وە لەگەڵ ئاژەڵدا نزیکتــرن ۰۰! وەیــا بە لێکدانەوەیــەکی‌تر بڵێــین : ئەوانە «ئیسلام»ێکیان ئەوێ کە بەرگریی مرۆڤ نــەکات لەوەی کە : لە مزگەوتدا نوێژ بکاتو لە ئاهەنگەکانیشا سەماو هەڵپەڕکێ بــکات ۰۰ ڕۆژو بگرێ لە ڕەمەزاناو دوای تۆپی بەربانگیش (عەرەق) بخواتەوە ۰۰!! کەوابوو ـ بەلای ئەوانەوە ـ قەیناکات لەیەك کاتا موسڵمانێکی نوێژکەرو ڕۆژوگرو عەرەقخۆرو شەرواڵپیس بێت ۰

«ئیسلام»ێکیان ئەوێ کــە بگونجێت لەگــەڵ ئەوەدا کە : بــاوك لە ڕیزی یەکەمی مزگــەوتا بێ‌و کچــەکەیشی لە ئەوروپــادا ، وەیــا لەهــەر وڵاتێکی‌تردا بسووڕێتەوە بە (مینی‌جۆب)ەوە ۰۰! ۰

«ئیسلام»ێکیان ئەوێ کە باسی ڕەوشتو خووی پەسەندی تیا نەکرێ ، تا «ئازادیی‌و سەربەستی‌یەکەی» ! ئەوان جێ‌بەجێ ببێ ۰



# لە کۆتاییدا :

لە کۆتاییدا هیوادارم کە هەر یەکە لە ئێمە ئاوڕێك بداتەوە بەلای ئیسلاما، وە بە چاوێـکی زۆر ووردەوە سەیری بەرنامـەکەی بکات تا درۆو ڕاسـتیی بۆ دەرکەوێ لەو بانگەوازانەی دوژمنانی ئیسلام ئەیانکەن ٠

هەروەك داخوازیشم ئەوەیە : هەموو کەسێك بزانێت کە :

«تەنها بە باوەڕێکی ناو دڵ ، یا وتەی سەر زمان ، یا چەند بەندایەتیی‌و دروشمێك ئیسلام پێك نایێت‌و تەواو نابێت ٠ چونکە ئیسلام بەرنامەیەکی پڕ لە یاساو نەریت‌و دەستوورو پەرستن‌و ویل‌و شێوازو ڕەوشتە ٠٠ وە ئەمانە لە یەك جیا ناکرێنـەوەو بەش‌بـەش ناکرێـن ٠ هـەرکەسێ هەندێـکیان بـکاو واز لە هەندێکیان بێنێ بەوە نـابێت بە موسـڵمان ٠ یا خـۆیشی بە موسـڵمانێکی گەورە دابنێ ٠

ئیسلام دەستی بەزەیی‌و سۆزی ڕاکێشاوە بۆ هەموو سووچێکی ژیان ، وە هیچ گرێ‌و قۆرتێـکی نەهێشتووەتەوە لە بەردەم مرۆڤدا ٠٠ سـا مەگەر چاوی خۆی کوێر بکات‌و خۆی گێل‌و ویل بکات ٠

ئیسلام بریتی‌یە لەو ڕاستی‌یانەی کە وەك ئەستێرە گەشن ، بێ‌شاردنەوەو بێ پێچ‌و پەنا ٠

بەڵام ــ بە داخەوە ــ لـەم دوا دواییەدا کاتێ ئیمپریالیزمـەکان پەلیان داهێشت بەسەر وولاتە ئیسلامی‌یەکانا ٠٠ موسڵمانەکان خۆیان لەبیر چووەوەو ئایین‌و بەرنامەی ئیسلامیان بـەلاوە سووك‌و بێ‌بایەخ بوو ، وە بەجـارێ ڕووی گوێ‌و دڵیان تێکردن ، بە زانیاریی بوونەوەریی ئەوان سەرسام بوون و کەوتنە باس‌و خواسیان ، وایـان‌زانی کە لە هەموو ڕوویەکی تریشا پێشـکەوتوون ٠٠! وەك لە ڕووی دەستکردەکانیانا پێشکەوتوون ٠ وە لە لایەکی‌تریشەوە ــ ئەڵبەتە

هەر ئەو هەوا تینی تێکردن ـ بەشی زۆری موسڵمانەکان لە بەرامبەری ئیسلامەوە کەمتەرخەم بوونو گوێیان نەدایە ، وە زاناکانیش لە کاکڵەی زانیاریی دەرچوون ـ کەمێکیان نەبێ ـ خویان دایە پەراوێزو زاراوەکانو کەوتنە ڕۆچوون تیایا ، ڕاڤە لەسەر ڕاڤەو پەراوێز لەسەر پەراوێز ۰

بەڵام قورئانی گەورە ئەبوایە هەر بۆ فێربوونی ووشەکانیو خوێندن بخوێنرایە ، تەفسیرو ماناکردن قەدەغە بوو ۰۰!! ۰

خۆ (سیرەت)و مێژوو و وێنەیان هەر ناوی نەبوو ۰

وە لە بەشی تەریقەتیشا لە چەند نیشانەو وێردی تایبەتیی بەولاوە گوێ بە ئیشو کاریتر نەئەدرا !! ۰

بەم ڕەنگە ئەو بەرنامە گەورەیە ـ کە زانایانی جیهانی بە کۆنو تازەوە سەرسام کردووە ۰ کورت کرایەوەو تامو مەزەی تیا نەهێلراو ، کرا بە نەختە توێکڵێو موسڵمانەکان خۆیان کوتایە بن باڵی ئەموئەو ! دوژمنانی ئیسلام باویان بێ خۆش بوو ، دەستیان کێشا بەسەر دڵو دەروونو مێشکی موسڵمانەکانا پێش ئەوەی وولاتەکەیان داگیر بکەن ۰

سەرئەنجام بە «دواکەوتن دواکەوتن» کەوتنە دوای ئیسلام ، وایان خستە پێشچاو ڕۆڵەکانی ـ کە ئیسلام ـ ئەشکەنجەو بەندیخانەی ئادەمیزادە !!

ئەمانیش باوەڕیان پێهێنانو دوایان کەوتن ۰

ئیتر یارمەتیمان لە خوای گەورە ئەوێ ۰

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين

١٣٩٨ ك

١٩٧٨ ز

# سەرچاوەكان

١ ـ القران الكريم •

٢ ـ العدالة الاجتماعية في الاسلام •

٣ ـ السلام العالمى والاسلام •

٤ ـ ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين •

٥ ـ الاســـــلام •

٦ ـ المدخل لدراسة الشريعة الاسلامية •

٧ ـ احكام الذميين والمستامنين في دار الاسلام •

٨ ـ مجموعة بحوث فقهية •

٩ ـ شبهات حول الاسلام •

١٠ـ فقه السنة •

١١ـ العبادة في الاسلام •

١٢ـ اشتراكية عمر •

١٣ـ الاسلام يقينا لا تلقينا •

١٤ـ روح الدين الاسلامى •

١٥ـ المسلمون والعلم الحديث •

١٦ـ اشتراكية الاسلام •

١٧ـ العمل والضمان الاجتماعى في الاسلام •

١٨ـ الاسلام والمناهج الاشتراكية •

١٩ـ اسلامنا •

٢٠ـ تاريخ الاسلام •

٢١ـ الطب محراب للايمان •

٢٢ـ الخطايا في نظر الاسلام •

٢٣ـ الاسلام وقضايا المرأة ٠

٢٤ـ قصص الانبياء ٠

٢٥ـ ژيانى پێغەمبەرى مەزن (محمد) ٠

٢٦ـ تەفسيرى خاڵ ٠

٢٧ـ شەريعەتى ئيسلام ٠ وە هەندێ سەرچاوەى تريش ٠

× × ×

خوێنەری بەرێز :
ئەم هەڵانەو هەر هەڵەیەکی تریشت بەرچاوکەوت تکایە راستیان بکەرەوە:

| ل | د | چەوت | راست |
| --- | --- | --- | --- |
| ٦ | ٥ | شرەفی | شەرەفی |
| ٧ | ١٩ | والذین | ودَ الذین |
| ٢٥ | ١٩ | دەوڵە | دەوڵەتە |
| ٢٧ | ١٠ | نەڕوخێننو | نەڕوخێنینو |
| ٢٧ | ١١ | پارمەتمان | یارمەتیمان |
| ٣٤ | ٢٢ | بالبیانات | بالبینات |
| ٣٤ | ٤٤ | لیظلمکم | لیظلمهم |
| ٣٥ | ٤ | والوانها | الوانها |
| ٣٥ | ٥ | ٢٧ـ٨٢ | ٢٧ـ٢٨ |
| ٤٠ | ١٧ | الکافر | کافر |
| ٦١ | ٢٠ | ١٩٧٣ | ١٧٩٣ |
| ٦٣ | ١٧ | ن | من |
| ٦٤ | ١٨ | ١/٥ی ئەکرێ | أـ١/٥ی ئەکرێ |
| ٦٤ | ١٩ | بەشێکی دائەنرێ | ١ـ بەشێکی دائەنرێ |
| ٦٤ | ٢٠ | بۆ ئەوانەی | ٢ـ بۆ ئەوانەی |
| ٦٥ | ٢ | ١ـبۆ هەتیوان | ٣ـ بۆ هەتیوان |
| ٦٥ | ٣ | ٢ـ بۆبێنەوایان | ٤ـ بۆبێنەوایانو .. |
| ٦٥ | ٤ | ٣ـ بۆ ڕێبواران | ٥ـ بۆ ڕێبواران |
| ٦٥ | ٥ | ٤ـ چواربەشەکەی.. | ب ـ چواربەشەکەی .. |

| ل | د | چەوت | راست |
|---|---|---|---|
| ٧٣ | ١٨ | مەدینە | مەککە |
| ٧٨ | ١٥ | قیزەو | قیزوو |
| ٨٥ | ١ | خشکی | خوشکی |
| ١٠٠ | ٣ | رایین | راییْن |
| ١٠٩ | ـ | ئەبەن، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەفەرموێ | بە زیادە نووسراوە ٠ |
| ١١٢ | ـ | ولو كان النساء كما ذكرنا ٠٠ | هیی (موتەنەبی)یە |
| ١٣١ | ٣ | ظ | ط |
| ١٣٢ | ١٣ | ئەوانیش | ئەوانەیش |



## ناوەرۆك


| بابـــەت | لاپـــەرە |
|---|---|
| پێشەكی | ٥ |
| سەرەتای باسەكان | ٩ |
| بەندە لە پێش ئیسلاما | ١١ |
| بەندە لە ئایینی ئیسلاما | ١٢ |
| سەربەستیی لە ووتەو رادا | ١٩ |
| سەربەستیی لە ئاینداریيدا | ٢٥ |
| بۆچی سەرانە دانراوە | ٢٧ |
| ئایا دێرو كەنشتەكان تازە ئەكرێنەوە ..؟ | ٣٢ |
| سەربەستیی لە زانستو زانیاریيدا | ٣٤ |
| ئیسلامو فێربوونی زمانی بێگانە | ٣٧ |
| زاناكانی ئیسلامو بەشەكانی زانیاریی | ٣٩ |
| سەربەستیی لە ئیشكردندا | ٤٨ |
| یاسای ئابووری سەرمایەداریی | ٤٩ |
| یاسای ئابووری كۆمۆنیستیی | ٥١ |
| نرخو رێژی كارو كرێكار لە ئیسلامدا | ٥٦ |
| تەمەڵیو ئیشنەكردن | ٥٧ |
| پەیوەندی كرێكار بە خاوەن كارەوە | ٦٠ |
| سەربەستیی لە خاوەنێتیدا | ٦٢ |
| بینیەی ئیسلام لە سامانذا | ٦٧ |
| دابەش كردنی هۆیەكانی ژیان | ٧١ |

بیینیەی ئیسلام لە خۆماڵیکردندا ٧٥
سنووریك بۆ خاوەنێتی تاكیی ٧٦
سەربەستیی لە جلو بەرگدا ٧٧
بەرگی ئافرەت لە ئیسلاما ٨٣
رۆژی رەشی ئافرەت ٨٨
چەند رەخنەیەك لە ئیسلام سەبارەت بە ئافرەت ٩٥
نیشتگەی راستەقینەی ئافرەت ٩٧
بۆچی سەرپەرشتیکردنی خێزان دراوەتە دەست پیاو ٠٠؟ ١٠١
بۆچی پیاو لە میراتا دوو ئەوەندەی ئافرەت ئەبات ٠٠؟ ١٠٦
خۆزگە ئەمزانی ١١٣
سەربەستییی بیرو ژیریی ١١٥
چارەسەرێك ١٢٥
چارەسەرێك ١٢٨
زیانەكانی عەرەق‌و بیرە ١٣٠
ئیسلام سەربەستیی تیایە ٠ بەلام نەك بۆ شەروالپیسی‌و بەرەآلایی ١٣٣
داخوازی لاشەیی‌و نەژادی ١٣٦
لە كۆتاییدا ١٣٩
سەرچاوەكان ١٤١

★ زۆر سوپاسی خاوەنی چاپخانەی نەورەس ئەکەم ، وە خوای گەورە پاداشی بداتەوە لە هەردوو جیهانا بۆ لەچاپدانی ئەم کتێبە ٠

★ سوپاسی هەموو کرێکارەکان ئەکەم سەبارەت بەو ئەزیەتەی کێشایان لە بێناوی لەچاپدانی ئەم کتێبەدا ٠ وە هیوادارم خوا هیدایەتیان بدات ٠

**یالآنپێیی**

## ئەم کتێبە

★ ئایا سەربەستیی کامەیە ••• ؟ بریتیی‌یە لە ئاشووبەو ئاژاوەنانەوەو بەرەڵلایی‌و راکردن لە یاسا ••؟ ! بە ئارەزوو رابوێرێ •• تەماشای شەرەفی ئەمو ئەو بکات •• ؟! هەموو کەس دەست لە شەرەف‌و ناموسی بشۆرێ ••• ؟! جەردەیی بکرێ ••• گزیکاریی‌و خەیانەت •• بەرتیل •• ؟! سووخواردن ••؟ داماڵینی بەرگی غیرەت‌و شەرەف ••؟!•

★ چمکێکی سەربەستیی نیشان ئەدات لە ئیسلاما ، بە تایبەت لەم چەند خاڵانەی خوارەوە :

★ نرخ‌و رێزی کرێکار لە ئیسلاما •

★ خەشم‌و قینی ئیسلام لە بێکارەو تەمەڵ‌و دەستپانکردنەوە (سوال) •

★ بایەخ‌و رێزی ئافرەت لە ئیسلاما • لەگەڵ چاوگێڕاندنێك بە یاساکانی تری جیهانا •

★ زیانەکانی عەرەق‌و بیرە •

★ زیانەکانی تێکەڵاوی نێرینەو مێیینە •

★ بەراوردێکی یاسای ئابووری •

- ١٩٨٣/١٢/٣١

کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغداد ١٣٦١/١٩٨٣

نرخی دینارێکە